زنجیرەی ئاگایی ١٤

# بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن

عەلی باپیر



## ناوەندی ڕاهێنان و گەشە پێدان

ناوەندێکە، لە پەیڕەوی نێوخۆی پەسندکراوی کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان/عێراق ساڵی 2015 وەکو یەکێك لە ئۆرگانە فەرمییەکانی حزب بڕیاری لەسەر دراوە و جێگیرکراوە. ئەرکە سەرەکییەکەی بریتییە لە گرنگیدان بە پەرەپێدانی تواناکان و پێگەیاندنی ئەندامان لە بوارە جیا جیاکان،و بایەخدان بە بواری ڕۆشنبیری و ڕاهێنان و گەشەپێدانی توانستەکانیان، بەمەبەستی دروستکردنی کادیر و سەرکردەی داهاتوو لە کایەی حزبی و حکومیدا.

# دەستپێك

برایان‌و خوشكانی بەڕێز!

سەرەتا دەستخۆشیی دەكەم لە (ناوەندی ڕاهێنان‌و گەشە پێدان)، كە ئەم پرۆژەیان بۆ بەندە پێشنیار كرد، كە ئـەم چالاكییەشیان مەڵۆیــەكی دیكەیــە، دەیخەنــە ســەر خــەرمانی چــالاكییەكانی دیكەیان.

ئـەو بابەتـە (بـەرەو بانگـەوازێكی ڕاسـت‌و ڕەسـەن)، مەبەسـتمان پێـی بانگـەوازی ئیسـلامییەو، سـەرەتا دەمـەوێ ئـەو ڕاسـتییە ڕابگەیەنم كە:

ئەم بابەتە، برای دڵسۆزتان زۆری خۆ پێوە ماندوو كـردوە، جگـە لـە خوێندنـەوەو موتـاڵای وردو قـووڵی چـەند ڕۆژە، ڕاوێژیشـم لەسەر كردوەو، ئیستیخارەشم بۆ كـردوە، دوعـاو پاڕانەوەشـم بـۆ كردوەو، ئومێدم وایە كە ئەوە بڵێم‌و، ئـەوە ڕوون بكەمـەوە, كـە

**جێگای ڕەزامەندیی خوای پەروەردگار بێ، پاشان مایەی سوودو کەڵکی ئێوەش بێ[١].**

**ئەوەی کە لەم پێنج وتارەدا دەمەوێ پێشکەشی ئێوەی بکەم لەو دە (١٠) تەوەرەیەدا، کە دوایی ناوونیشانەکانیان دەخەینەڕوو، گوشراوو پوختەی ئەوەیە کە من بەڕاستی دەزانم‌و, بە چاکی دەزانم ئێمە کارو جموجۆڵ‌و چالاکی بانگەوازی خۆمانی پێ ئەنجام بدەین، گومانی تێدانیە کە بانگەوازی ئیسلامیی بە هەموو جۆرەکانیەوەو لە هەموو ئاستەکانداو، بە چەمك‌و واتای فراوانی بانگەوازی ئیسلامیی، بە بزوێنەرو داینەمۆیی دینداریی‌و مسوڵمانەتیی دادەنرێ: ئەگەر پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دوای ئەوەی خوای پەروەردگار بە دواندن (خطاب)ی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ١﴾المزمل، دەیکردە پێغەمبەر**

[١] – بۆ بینینی سەرجەم دەرسەکان سەردانی کەناڵی تایبەتی بەندە بکەن لە یوتیوب بەو لینکەی خوارەوە:
https://www.youtube.com/playlist?list=PL٦HuvNeXiFwuQUYJw٨MFopops٧Abo٦iNN

(نبي)، ئەگەر دواتر بە دوانـدن (خطـاب)ی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢﴾المدثر، نەیكردبایە ڕەوانەكراو (رَسُول)، بـە تەئكیـد ئـەو بانگـەوازو پەیامـەی خـوا بـە ئێمـە نەدەگەیشـت، چـونكە زانایان دەڵێن: پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ خـوای پـەروەردگار دوای ئەوەی بە پێنج ئایەتی سەرەتای سووڕەتی (العلق) دواندی:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ٥﴾العلق.

كە ئەمانە پێنج ئایەتی سـەرەتای قورئـان بـوون، دابەزینـە سـەر دڵـی موبـارەكی پێغەمبـەر ﷺ دوای ئـەوە, یەكسـەر سـووڕەتی (المزمل) هاتە خوار، چونكە پێغەمبەر ﷺ چۆوە بـۆ مـاڵێ‌و، بـە خەدیجـەی خێزانـی خـوا لێـی ڕازی بـێ، فـەرموو: {زَمِّلُـونِي

زَمِّلُونِي}[٢]، واتە: دامپۆشن، دامپۆشن، لەرزی لێهات، حاڵەتێکی

نا ئاسایی بۆی ڕوویداو، گوتیشی: لە خۆم ترسام، بەڵام ئەوە بوو

کە خەدیجە خوا لێی ڕازی بێت، دڵی دایەوە، گوتی: {كَلاَّ أَبْشِرْ فَوَاللَّهِ لَا يُخْزِيكَ اللَّهُ أَبَدًا وَاللَّهِ إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَصْدُقُ الْحَدِيثَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ، وَتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ} أخرجه البخاري: ٦٥٨١، ومسلم: ٤٢٢. واتە: نەخێر وەڵڵاهی خوا هەرگیز تۆ ڕیسوا ناکات، تۆ

خزمایەتی دەگەیەنیو، ڕاستگۆییو، دەستبارگریی لە

تەنگانەداو، هاوکاری نەدار دەکەیو، ڕێزی میوان دەگری..

کۆمەڵێك لە سیفەتە بەرزەکانی پێغەمبەری هەڵدان ﷺ.

بەڵێ خوا عزوجل بە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ١﴾، موحەممەدی ﷺ

کردە پێغەمبەر (نبي)، بەڵام دوایی ئەوەبوو کە سەرەتای

سوورەتی (المدثر) دابەزی:

---

٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: ٤، وَمُسْلِمٌ برقم: ١٦١، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: ٣٣٢٥.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤ وَٱلرُّجۡزَ
فَٱهۡجُرۡ ٥ وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ ٦ وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ ٧﴾ المدثر.

**واتە: بە ناوی خوا بە بەزەیی بەخشندە**

**ئـەی خـۆ لەنوێنـەوە پێچـەر! هەڵسـە (خـەلك) بێـدار بکـەوە، پـەروەردگارت بـە گـەورە بگـرە، پۆشـاکت چـاك ڕابگـرە، واز لـە گوناهو پیسیی بێنەو، بە زۆر دیتنەوە منـەت لەسـەر چاکەکانت مەکەو، بۆ پەروەردگارت خۆت ڕابگرە.**

**بەم سەرەتای سووڕەتی (المدثر) پێغەمبـەر ﷺ وەك ڕەوانـەکراو (رسـول) مـولزەمو موکەللـەف کـرا بـەوەی کـە ئـەوەی کـە وەك (نبـي) وەریگرتـوە، وەك (رسـول) بیگەیـەنێ، ئنجـا ئەگـەر پێغەمبـەر ﷺ وای نەکردبوایـە، بـە دڵنیـایی ئـەو پەیامـە بـە دەستی ئێمە نەدەگەی، وە دواییش هاوەڵانی بـەڕێزی پێغەمبـەر**

ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ، بە تایبەت چوار خەلیفە ڕاشیدەکەی، ئەگەر ئەوانیش وەك پێغەمبەری خاتەمیان نەکردبایەو، بەردەوام نەبووبان لەسەر گەیاندنی پەیامی خوا، دیسان بڵاو نەدەبۆوە، هەروەها دوای ئەوانیش جیلی شوێنکەوتووان (تابعین)، وە شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووان، وە هەتا گەیشتۆتە ئێستا.

بەڵێ، بانگەواز واتە: بانگکردنی خەڵك بۆ لای خواو بۆ لای ئایین‌و پەیامی خوا، داینەمۆو بزوێنەری دینداریی‌و مسوڵمانەتیە، ئەوەش ئەرکێکە سەرەتا پێغەمبەری خاتەم ﷺ پێی ئەرکدار (مکلف) کراوەو، دوای خۆیشی هەموو ئۆممەتەکەی، بە زۆر بەڵگان، بۆ وێنە: ئەم ئایەتە موبارەکە کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً ۖ قُلِ اللَّهُ ۖ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ۚ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا الْقُرْآنُ لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ ... ﴿١٩﴾﴾ الأنعام، (خوا بە پێغەمبەر دەفەرموێ:) بڵێ: چ شتێك شایەدیی بدات گەورەترە، {چاوەڕێی

وەڵامی ئەوان مەکە}، بڵێ: خوا، {ئەگەر خوا شایەدیی بدات، شایەدییەکەی لە هی هەموو کەس گەورەترە}، ئنجا بفەرموو: خوا شایەدە, لە نێوانی من و ئێوەدا، {کە منی کردوە بە پێغەمبەر}، ﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ ﴾، ئەم قورئانەشم بۆ ڕەوانکراوە، خوا شایەدە، کە من پێغەمبەری خوا بم و ڕەوانەکراوی خوام، ﴿ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾، ئەم قورئانە ﴿ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾، بۆ ئەوەی ئێوەی پێ هۆشیار بکەمەوەو, هەرکەسێکی دیکەش کە پێی دەگات، هەر کەسێکی دیکەش کە پێی دەگات، بەم قورئانەوە هۆشیارو، ئاگاداری دەکەمەوەو، وریای دەکەمەوە، کە بزانێ چییە؟ لە کوێوە هاتوە؟ بۆچی هاتوە؟ بۆ کوێ دەچێ؟

کەواتە: وەك زانایان دەڵێن: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کەسێك ئەو پەیامە، ئەو قورئانەی پێ دەگات, ئەویش وەك پێغەمبەر ﷺ مولزەمە کە بیگەیەنێ بە هەموو شێوەکانی گەیاندن، کە دوایی باسیان دەکەین.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {بَلِّغو عَنِّي وَلَو آيَةً}[٣]،

واتە: ئەگەر ئایەتێکیش بێ لە منەوە بیگەیەنن،

بۆ بابەتەکەشم: (بەرەو بانگەوازێکی ڕاستو ڕەسەن)م وەك ناوونیشان هەڵبژاردوە، بۆیە با ئەم دوو وشەیەتان تۆزێ بۆ شی بکەمەوە:

مەبەستم لە ڕەسەن (أَصِيل)، ئەوەیە کە ئەو بانگەوازە دەبێ بریتی بێ لە پەیامو بەرنامەی تێرو تەواوی خوا کە لە قورئانو سوننەتدا بەرجەستەیە.

هەروەها مەبەستم لە ڕاستبوون (صحیح)ەکەشی ئەوەیە: بە شێوەیەك بگەیەنرێ، کە پڕ بە پێستی واقیع بێو، ئامانج بپێکێ، لە ڕاستیی دا کاری ئیسلامییو، هەموو جموجۆڵێکی ئیسلامیی دەبێ هەم ڕاستبێ، هەم ڕەسەن بێ، ڕاستبێ، واتە: وەك لەبەرچاوگرتنی ئەو واقیعە کە تێیدا ئەنجام دەدرێ، ئەو

---

٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: ٤٩٦.

ژینگەیـە، ڕەسـەنیش بـێ، واتـە: شـتێك نـەبێ کـە ڕەگو ڕیشـەو

ئەسڵێکی شەرعیی نەبێ.

# ڕێ خۆشكردن

لە دە (١٠) تەوەرو لە دووتوێی پێنج وتاردا پێشكەشتان بكەین، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

تەوەری یەكەم: پێناسەی بانگەواز.

تەوەری دووەم: گرنگیی‌و پێگەو حوكمی بانگەواز.

تەوەری سێیەم: پلەو پایەی بانگەوازكاران.

تەوەرەی چوارەم: ئامانج‌و مەبەستی بانگەواز.

تەوەری پێنجەم: ڕێبازی بانگەوازو، شێوازو ئامرازەكانی.

تەوەری شەشەم: چەسپاوی ڕێبازو ئامانجی بانگەوازو، داهێنان‌و تازەگەری بەردەوام لە شێوازو ئامرازەكانیدا.

تەوەری حەوتەم: بنەما گرنگەكانی بانگەواز.

<u>تـــەوەری هەشـــتەم</u>: ئاكـــارو ڕەوشـــتە پەســـندە بنەڕەتیـــەكانی بانگەوازكاران.

<u>تـــەوەری نۆیـــەم</u>: چـــەند هەڵـــەو نەخۆشـــییەكی بەشـــێك لـــە بانگەوازكاران.

<u>تـەوەری دەیـەم</u>و <u>كۆتـایی</u>: چـۆن دەتـوانین بانگـەوازێكی ڕاسـتو ڕەسەن بۆ ئیسلام بكەین؟

## تەوەری یەكەم

## پێناسەی بانگەواز

بەڕێزان!

گەلێك جار بۆ هەندێك لە وشەكان كە لە قورئانـدا هـاتوون، یـان لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ چەمك‌و واتایەكی باوو عورفیـان بۆ دادەتاشین‌و، قەتیسیان دەكەین لەو چەمك‌و واتایانەدا كـە لـە ڕۆژگـاری ئێمـەداو، لـەلای ئێمـە بـاون، بـەڵام مـەرج نیـە لـە بەكارهێنانی قورئانـدا وابـێ، یـەكێ لەوانـە ئـەم وشـەی بانگـەواز (دعوة)ە، بانگـەواز ئێمـە هـەر وای لـێ حـاڵین: مامۆسـتایەك كـە وتار دەدا (وتـاری جومعـە) یـاخود وتارەكـانی دی، یـاخود كـە لـە بۆنەكانی دیكە قسە بۆ خەڵك دەكات، یـاخود كەسـێك كـە دەرس دەڵێتەوە، یان ئامۆژگاریی خەڵك دەكات، ئێمە وای لێ حـاڵین كـە بانگەواز ئەوەیە!

بەڵام براو خوشكانی بەڕێز!

وەك دوایـیش زیـاتر ڕوونـی دەكەمــەوە، بانگـەوازی ئیسـلامیی (الدعوة الإسلامية) هەموو جموجۆڵ‌و چالاكیەكانی ئینسان كـە ئەنجامیان دەدا، بە مەبەسـتی ئـەوەی ئـایینی خـوای پـەروەردگار بۆ خەڵك ڕوون بكاتەوە، چەمكی بانگـەواز هـەمووی دەگرێتـەوە، بەڵكو جاری وا هەیـە كـردەوەو ئاكـارو هەڵوێسـتی ئینسـان, ئنجـا كردەوەی كۆمەڵایەتییە, هەڵوێستی سیاسییە, ئاكـاری خێزانییـە، زۆر كاریگــەرترە لــە وتارێــك، بگــرە لــەدەیان وتــاریش، بــۆ بـانگكردنی خــەڵك بــۆ ئیســلام‌و بەرچـاو ڕوونكردنــەوەیان لــە بارەیەوە.

ئایا پێغەمبەری خاتەم ﷺ تـەنیا هـەر بـە زمـانی وتـار، ئـایینی پێشانی ئێمەداوە؟ نەخێر، بەڵكو زیاتر بە زمانی كردار، زانایـانی فەرموودەناس دەڵێن: فەرمایشتە موتەواتیرەكان كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بــە زاری موبـاڕەكی فــەرموونی، هەنـدێك دەڵـێن: دە

(١٠)ن، هەندێك دەڵێن: چوار (٤)ن، گرنگ ئەوەیە لەو سنوورە دان، هەڵبەت هەیشن گوتوویانە: زیاترن، بەڵام كە دێنە سەر دیاریكردنیان مشتو مڕیی زۆر دروست دەبێ، ئایا دەقەكانی سوننەت كە بە شێوەی تەواتوور بە ئێمە گەیشتوون، هەر ئەوەندەن؟! نەخێر، بەڵام زۆربەی دەقەكانی سوننەت كە بە تەواتوور بە ئێمە گەیشتوون، هەموویان دەقی سوننەتی كردەیی (السنة العملیة)ن، بۆ وێنە: پێغەمبەر ﷺ لەبەر چاوی هاوەڵان نوێژی كردوە، لەسەر میمبەر، بەلای كەمەوە دوو جار نوێژی كردوە لەسەر مینبەرو، فەرموویەتی: {صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي}[٤]، واتە: وەك چۆن بینیتانم نوێژم كرد، نوێژ بكەن. ئەوە هەموویان بینیویانە، هەروەها كە كۆچی كردوە، كە جەنگی كردوە، كە سەردانی دراوسێی كردوە، كە هەڵسوكەوتە جۆراو جۆرەكانی كردوون، هەموویان بە كردەوە بوونو، هەمووشی پێشاندانی ئیسلام بووە.

---

٤) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: ٦٣١.

**بۆیە لەسەرەتاوە دەمەوێ ئـەوەتان عەرزکـەم, کـە لـە ڕاسـتیی دا چـەمکی بانگـەواز زۆر فـراوانترە لـەوەی کـە لـە زەیـن‌و مێشـکی زۆربەی ئێمەدا هەیە کە پێمان وایە: بریتیە لە وتـاردان‌و دەرس گوتنەوەو، ئامۆژگاریی کردنی خەڵك چ بە تاك‌و چ بە کۆ!**

**ئێستاش وەك چەند نموونەیەك پێنج پێناسان دەخەینەڕوو:**

**<u>پێناسەی یەکەم:</u>**

**ئیبنـو تەیمییـە گوتوویـەتی:** (الـدَّعوَةُ إِلـى اللهِ هِـيَ الـدَّعوَةُ إِلـى الإِيمَان بِهِ، وَبمَا جَاءَت بِهِ رُسُلُهُ بِتَصـدِيقِهِم فِيمَـا أَخبَرُوا بِـهِ, وَذَلِكَ يَتَضَمَّنُ الدَّعوَةَ إِلى:

الشَّـهَادَتَين، وَإِقَـامِ الصَّـلاةِ, وَإِيتَـاءِ الزَّكَـاةِ, وَصَـومِ رَمَضَـان, وَحَـجِّ البَيـتِ، وَالـدَّعوَةِ إِلـى الإِيمَـانِ بِـاللهِ, وَمَلائِكَتِـهِ, وَكُتُبِـهِ, وَرُسُلِهِ, وَالبَعـثِ بَعدَ المَـوتِ, وَالإِيمَـانِ بِالْقَـدَرِ خَيـرِهِ وَشَرِّهِ، وَالدَّعوَةُ إِلى أَن يَعبُدَ العَبدُ رَبَّهُ كَأَنَّهُ يَرَاهُ....

وَكُـلُّ مَـا أَحَبَّـهُ اللهُ وَرَسُـولُهُ مِـن وَاجِـبٍ وَمُسـتَحَبٍّ مِـن بـاطِنٍ وَظَـاهِرٍ, فَمِنَ الدَّعوَةِ إِلى اللهِ: الأَمـرُ بِـهِ, وَكُـلُّ مَـا أَبغَضَـهُ اللهُ

وَ رَسُولُهُ مِن بَاطِنٍ وَظَاهِرٍ, فَمِنَ الدَّعوَةِ إِلى اللهِ: النَّهِي عَنهُ, وَلا تَتِمُّ الدَّعوَةُ إِلى اللهِ إِلاَّ بالدَّعوَةِ إِلى أَن يُفعَلَ مَا أَحبهُ اللهُ, وَيُترَكَ مَا أَبغَضَهُ اللهُ سَوَاءٌ، كَانَ مِنَ الأَقوَالِ أَوِ الأَعمَالِ البَاطِنَةِ وَالظَّاهِرَةِ)[٥].

**كە پێم وایە پێناسەیەكی زۆر باشی كردووەو چەمكو واتای بانگەواز باش ڕوون دەكاتەوە، دەڵێ: بانگەواز بۆ لای خوا بریتیە لە خەڵك بانگكردن بۆ بڕوا پێهێنانیو، بڕواهێنان بەوەی كە پێغەمبەرەكانی (علیهم الصلاة والسلام) هێناویانە، ئەویش بەوە كە بەڕاست بزانرێن لەوەدا كە هەواڵیان پێداوە، ئەوەش ئەم شتانە دەگرێتە خۆی: هەردوو شایەتمانەكان، {واتە: (**أَشهَدُ أَن لا إِلهَ إِلاَّ الله، وَأَشهَدُ أَنَّ مُحَمَّد رسُولُ الله**)} و، بەرپا كردنی نوێژو، زەكاتدانو، ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزانو، حەجی ماڵی خوا، هەروەها بانگەواز كردن بۆ بڕواهێنان بە خواو، بە فریشتەكانیو، بە كتێبەكانیو، بە پێغەمبەرانیو، بە زیندوو بوونەوەی دوای مردن، وە بڕواهێنان بە قەدەر، خێرو شەڕی،**

---

٥) مجموع الفتاوى: ج١٥، ص١٥٧ و ١٦٧.

(واتــه: ئــەوەی کــە ئینســان پێــی خۆشــەو ئەوەشــی کــە پێــی ناخۆشــه)، هــەروەها بانگــەواز کــردن بــۆ ئــەوە کــە بەنــدە پەروەردگاری خۆی بپەرستێ وەك بیبینێ، (واتـه: بانگـەوازکردن بـۆ تەزکیـەی نـەفس‌و تەصـەووف‌و عیرفـانیش)، هـەروەها بـۆ شتێك کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ خۆشـیان ویسـتوە، چ واجـب بـێ، چ پەسـند بـێ، وە چ پـەنهان بـێ، چ ئاشـکرا بـێ، لـە بانگەوازکردنە بۆ لای خوا، کە فەرمانی پێ بکرێ‌و، هەرچـی کـە خـواو پێغەمبـەری خـواش، ڕقیـان لـێ هەڵبسـتێ، لـە پـەنهان‌و ئاشـکرا، لـە بانگەوازکردنـە بـۆ لای خـوا، کـە قەدەغـە بکـرێ، بانگەوازیش بۆ لای خوا، تـەواو نـابێ، مەگـەر بـەوە کـە هەرچـی خـوا فـەرزی کـردوە، ئـەنجام بـدرێ‌و، هەرچـی خـوا ڕقـی لـێ هەڵدەستێ، وازی لێ بهێنرێ، چ پەیوەندی بە قسانەوە هـەبێ، چ بە کردەوان، کردەوەو قسەکانیش چ پەنهان بن چ ئاشکرا.

**پێناسەی دووەم:**

**کە لە مەوسووعەی:** (الإسلامُ كَما يَتَجَلَّى في كِتَابِ الله)[٦] **وەوە دەیهێنین:**

(الدَّعوَةُ هِيَ: إلى اللهِ تَبَارَكَ وَتَعَالى، وَدِينِهِ القَيِّم، وَالهَدَفُ مِنهَا هُوَ إرجَاعُ النَّاسِ إلى رَبِّهِم لِلقِيَامِ بِعِبَادَتِهِ مِن خِلالِ الإلتِزَامِ بِشَرِيعَتِهِ, وَالإِقتِدَاءِ بِنَبِيِّهِ, سَواء كَانَ ذَلِكَ الإرجَاعُ مِنَ الكُفرِ إلى الإيمَان إبتِداءً, أَوَ مِنَ المَعصِيَةِ إلى الطَاعَةِ، تَوبَةً وَتَصحِيحاً, وَقَد يَكُونُ الهَدَفُ مِنَ الدَعوَةِ: الإستِمرَارُ عَلى الطَّاعَةِ وَالإزدِيَادِ مِنهَا, زِيادَةً في الإهتِدَاء، وَكُلُّ ذَلِكَ بِالقَولِ وَالفِعل، أَوِالقَالِ وَالحَال).

**واتە: بانگەواز بریتیە لە بانگکردنی خەڵك بۆ لای خوا تبارك وتعالی و، بۆ لای ئایینە ڕێكو ڕاستەكەی‌و، ئامانج لە بانگەواز، بریتیە لە گێڕانەوەی خەڵك بۆ لای پەروەردگاریان، بۆ هەڵسان بە بەندایەتیی کردنی لەمیانی پابەندیی بە شەریعەتەکەیەوەو،**

---

٦) الكِتابُ الحادِي عَشر، ج٩، ص٢٠٠، الطبعة الثانية: ٢٠١٩.

لــەمیانی شــوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەیــدا ﷺ، ئنجــا ئــەو گێڕانــەوەی خەڵکــە بــۆ لای خــوا، چ لــە کــوفرەوە بــێ، بــۆ ئیمــان، (خــەڵکی نامســوڵمان بــانگ بکــرێ بــۆ ئیســلام)، چ لــە گونــاهو تاوانــەوە بــێ بــۆ تاعــەتو فەرمانبــەریی، (وەك گەڕانــەوەو ڕاسـتکردنەوە)، جـاری واش هەیـە بانگـەواز بـۆ ئەوەیـە کـە ئـەو مرۆڤە لەسەر ئەو تاعەتو چاکەیە بەردەوام بێو، لە هیدایەتو تەقوا زیاد بکات، هەموو ئەوەش: چ بـە قسـە بـێ، چ بـە کـردەوە، یان چ بە زمانی وتار بێ، چ بە زمانی حاڵ.

پێناسەی سێیەم:

ئەمــەش پێناســەیەکی کورتــە، (د. رؤوف شـلبي) لــە کتێبــی: (الدَّعوَة الإسلامِيَّة في العَهد المَكِّي)[7]دا، هێناویەتی، دەڵێ:

(الدَّعوَةُ اللاِسلامِيَّةُ: حَرَكَةُ إِحيَاءٍ للنِظَامِ الإِلهِي الَّذِي أَنزَلَهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى نَبِيِّهِ الخَاتَم).

---

٧) ص٣٢.

**واتە: بانگەوازی ئیسلامیی بریتیـە لـە جموجـوۆڵی بووژاندنـەوەی سیسـتمی خـوایی کـە دایبەزاندۆتـە سـەر پێغەمبـەری کۆتـایی (موحەممەد) ﷺ.**

**پێناسەی چوارەم:**

(معـاذ إبـراهيم عتيلـي) **لـە** (التَّفَاعُـل الـدَّعَوِي عَبـرَ شَـبَكَاة التَّوَاصُل الإجتِمَاعِي)[^8] **دا، دەڵێ:**

(الـدعوة: نَقـلُ رِسَـالَةِ الإسـلامِ وَتَعلِيمِهَـا لِلنَّـاسِ فَردِيّـاً أَو جَمَاعِيّـاً, بِوَاسطَةِ وَسَائِل وَأَدَوَات مُبَاشِرَةٍ أَو غَير مُبَاشِرَة، بِحَيثُ تَهدِفُ إلى تَحسِينِ أَحوَالِ المُسلِمينَ, وَإِقنَاعِ غَيرِ المُسلِمِين للدخُولِ في الإِسْلاَم).

**واتـە: بانگـەواز بریتیـە گواسـتنەوەی پـەیامی ئیسـلامو، فێـری خـەڵك کردنـی، بـە تـەنیا, یـاخود بـە کۆمـەڵ، بـە هـۆی چـەند ئامرازێکەوە، ڕاستەوخۆ یان ناڕاسـتەوخۆ، کـە ئامـانج ئـەوە بـێ،**

[^8]: ٨) ص٣٣.

**حاڵی مسوڵمانان باشبێو، نامسوڵمانانیش قەناعەت پێ بهێنرێن بەوەی کە بێنە نێو ئیسلامەوە.**

**پێناسەی پێنجەم:**

**(د. محمد شريف بن كمال مشوّح)ە، لە کتێبی: (**فِقهُ دَعوَةِ غَيرِ مُسلِمين وَرِعَايَةُ المُسلِمِين الجُدُد) [٩] **دا، دەڵێ:**

(الدَّعوَةُ: فَنُّ إعلامِ الأَنَام بِدِينِ الإسلام, وَحَضِّهِم عَلَى الإيمَانِ بِاللَّهِ وَبَاقِي الأَركَانِ, وَالأَمرِ بِالتِزامِ الشَّرِيعَةِ وَتَعلِيمِهِم الدين, وَتَربِيَتِهِم عَلَيهِ, بِالأَسالِيبِ الشَّرعِيَّة المُمكِنَة, وَحَثِّهِم عَلى تَطبِيقِهِ فِي جَمِيعِ مَنَاحِي الحَيَاةِ, لِصَلاحِ حالِهِم في العاجِلِ وَالآجِل).

**واتە: بانگەواز بریتیە لە هونەری بانگکردنو ئاگادار کردنەوەی خەڵك، لە ئایینی ئیسلامو، هاندانیان بۆ ئەوە کە ئیمان بە خوا بێننو، ئیمان بە باقی پایەکانی دیکەی ئیمان بێنن، هەروەها**

٩) ص٣٥

فەرمانیان پێ بکرێ بە پابەندی بە شەریعەتەوەو ئایینیان فێر بکرێو، لەسەری پەروەردە بکرێن، بە شێوازە شەرعییە گونجاوەکانو، هانبدرێن لەسەر جێ بەجێکردنی شەریعەت لە هەموو ڕەهەندەکانی ژیانیاندا، بۆ ئەوەی هەم لە دنیادا حاڵیان باش بێو, هەم لە دوارۆژدا.

بەڕێزان!

ئایا ئێمە لەو پێناسانەوە چیمان بۆ دەردەکەوێ؟ ڕاستییەکەی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە لەسەرتاوە ئاماژەم پێدا: چەمکی بانگەواز زۆر فراوانو گشتگیرەو، هەموو ئیسلام دەگرێتەوە، وەك ئەوەی لە ئیبنو تەیمییەوە هێنامانو، ئەوەی خۆم هێنامو، ئەوەی لە زانایانی دیکەوە هێنامان، بانگەوازکردن بۆ ئیسلام واتە: بە کردارو بە وتار کارێك بکەی خەڵك پابەند بێ بە ئیسلامەوە، پێشێ لێی تێبگەن، ئنجا پێوەی پابەندبن، بۆ ئەوەی کە هەم لە دنیادا بەختەوەر بنو، هەم لە دوارۆژدا سەرفراز بن.

چـەند بەڵگەیـەكی دیكـە لەسـەر گشـتگیریی چـەمكو واتـای بانگەواز:

یەكـەم: خـوا سـبحانه وتعـالی دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡ... ﴿٢٤﴾ ﴾الأنفـال،

واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! بـە دەم بـانگی خـواو پێغەمبەرەكەیەوە بچن، هەر كاتێ بانگیان كردن بۆ شتێك كە پێی زیندوو دەبنەوە.

بێگومـان ئێمـە بـە هـەموو ئیسلام زینـدوو دەبینـەوە، كەواتـە: خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەموو ئیسلام بانگیان كردووین، چونكە بـە هـەموو ئیسلام زینـدوو دەبینـەوە، نـەك هـەر بـە ئیمانو عەقیدەكەی، یان تەنیا بـە عیبادەتەكەی, یان تـەنیا بـە ڕەوشـتەكەی ... هتـد، بـەڵكو بـە كـۆی شـەریعەتەكەی: چ پەیوەندیی بـە بـواری خێزانیی, چ كۆمەڵایـەتیی, چ سیاسیی, چ ئابووریی, هەر شتێكەوە هەبێ.

دووەم: هــەروەها ئەگــەر تەماشــای ئــەو فەرمایشــتەی خــوای پەروەردگار بکـەین, لـە سووڕەتی (النحل)دا کـە چـەند جارێکی دیکــەش دەیهێــنین، خــوا دەفــەرموێ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ ...﴿١٢٥﴾ ﴾، واتە: بانگ بکە بۆ ڕێبازی پەروەردگارت، ئایا ڕێبـازی پەروەردگارت چییە؟ بێگومـان قورئانـەو سوننەتەو، شـەریعەتی خوا هەموویەتی.

ئنجـا ئایـا بانگکردنەکـە, چـۆن بـێو چـۆنیان بـانگ بکـەین؟ دەگـونجێ بـە قسـە بانگیـان بکـەینو، دەگـونجێ بـە کـردەوەش بانگیان بکەین، کردەوەش زۆر جۆرە، وەك دوایی باسی دەکـەین، کردەوە هەر شتێكو دوو شت نیە: کردەوەی کۆمەڵایەتیی هەیە، خزمــەتگوزاریی هەیــە، کــردەوەی سیاســیی هەیــە، کــردەوەی خێزانیی هەیە، کرداری تـاکیی هەیـە، کرداری کۆمـەڵیی هەیـە، زۆر جۆری هەیە.

سـێیەم: هـەروەها ئـەو فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ کـە لـە صەحیحی بوخـاریی‌و صـەحیحی موسـلیم هـاتوە، کـە پێغەمبـەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب خوا لێی ڕازی بێ دەنێرێ، لـە کـاتی گرتنی قەڵاکانی خەیبەردا، دەفەرموێ: {أُنفُذ عَلـى رِسْلِكَ حَتَّـى تَنزِلَ بِسَاحَتِهِم ثُمَّ ادعُوهُم إِلى الإِسْلام}[10]، واتـە: بـە شـێنەیی بچـۆ، هـەتاکو دەچـیە شـوێنەکەیان، (دەچـیە ئـەو شـوێنەی کـە ئەوانی لێن)و، پاشان بانگیان بکە بۆ ئیسلام.

یانی: بانگیان بکـەن بـۆ ئیسـلام  بـە گشـتی‌و بـە هـەموو لایـەن‌و ڕەهەندەکانییەوە.

---

١٠) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: ٢٩٤٢, وَمُسْلِمٌ برقم: ٢٤٠٦.

**تەوەری دووەم**

## گرنگیی‌و پێگەو حوکمی بانگەواز

**بەڕێزان، خوشکان‌و برایانی خۆشەویستم!**

**ئەگەر تەماشای چەند دەقێك بكەین، زۆر بە ئاشكرا و ڕوونیی تێدەگەین كە گرنگیی بانگەوازو، پێگەكەی چۆنە؟ هەروەها حوكمەكەشی چییە؟**

**١)- بۆ وێنە: هەردووك ئایەتی: (٤٥ و ٤٦) لە سووڕەتی (الأحزاب):** ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَـٰكَ شَـٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَـذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ ﴾**، خوای پەروەردگار پێغەمبەری خاتەم دەدوێنێ، دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر! ئێمە تۆمان ناردوە، كە شایەدبیی‌و دڵخۆشكەربیی‌و، وریاكەرەوەبی، هەروەها بانگەوازكاربی بۆ لای خوا بە مۆڵەتی خواو، چرایەكی تیشكدەربی.**

کەواتــە: ئــەرکی ســەرەکیی پێغەمبــەر ﷺ ئــەوە بــووە کــە موژدەدەرو ترسێنەربێو، بانگکاربێ بۆ لای خـواو، وەك چـرایەك ڕێی دینداریی‌و مسوڵمانێتی بۆ خەڵك ڕۆشن بکاتەوە.

٢)- هەروەها ئەم ئایەتەی سووڕەتی (المائدة)، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ ...﴿٦٧﴾ ﴾، واتــە: ئــەی ڕەوانــەکراو! ئــەوەی لــە پەروەردگارتــەوە بــۆت دابــەزێنراوە، بیگەیەنــە، چـونکە ئەگـەر نەیگەیەنی (ئەگەر وانەکەی) پەیامی خوات نەگەیاندوە.

واتە: ئەگەر وانەکەی، مانای وایە تـۆ (رسـول) نـەبووی، چونکە (رسول) کەسێکە پەیامێکی پێدا نێردرابێو، دەبـێ ئـەو پەیامـە بگەیـەنرێ، چـۆنی بیگەیـەنێ؟ بـە هـەموو شـێوەکانی گەیانـدن، لێمان تێکنەچێ، تەنیا ئـەوە نیـە کـە وتاریـان بـۆ بـدات، چونکە پێغەمبـەر ﷺ بـە هـەموو شـێوەکانی گەیانـدن، پـەیامی خـوای گەیاندوە، ئنجا ئێمەش کە شوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرەین ﷺ,

هەمان ئەرك كە لەسەر شانى ئەو بووە، لەسەر شانى ئێمەشە، لە قەدەر تواناو بڕستو بۆ لوانمان، وەك خواى زاناو توانا لە سوورەتى (الأحزاب)دا دەفەرمویٚ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: بە دڵنیایی لە پێغەمبەرى خوادا باشترین سەر مەشقیی هەیە بۆ ئێوە، بۆ هەر كەسێك بە ئومێدى خواو ڕۆژى دوایی بێ ، وە زۆر یادى خوا بكات.

كەواتە: پێغەمبەر ﷺ بەچی ئەركدار (مكلف) كراوە، ئێمەش بە هەموو ئەو شتانە موكەللەفین, مەگەر شتێك بە بەڵگەیەك تایبەت كرابێ بە پێغەمبەرەوە ﷺ، زانایانی (أصول الفقه) هەموویان لەسەر ئەوە یەكدەنگن.

ئنجا بێگومان پێغەمبەر بۆ ئێمە نێردراوەو، دەبێ تەماشاى بكەینو شوێنی بكەوین، وەك لە سوورەتى (آل عمران)دا خوا

دەفـــــەرموێ: ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ﴿٣١﴾ ﴾،

واتـە: بڵـێ: ئەگـەر خواتـان خۆشـدەوێ شـوێنم بکـەون, خـواش

خۆشی دەوێن.

لەچی دا شوێنی بکەوین؟ بـە دڵنیـایی لـە هـەموو شـتێکدا، ئنجا

وەك چۆن لە ئیمان هێنانو، لە عیبادەتو خوا پەرستییەکانداو،

لە ڕەوشتەکانیی دا شوێنی دەکەوین، دەبێ لە گەیانـدنی پـەیامی

خواشدا بە هەموو شێوەکانی گەیاندن، هەر شوێنی بکەوین.

٣)- لـە سـوورەتی (العصـر)دا، کـە سـوورەتێکی کـورتی سـێ (٣)

ئایەتییە، خوا دەفەرموێ:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَٱلۡعَصۡرِ ﴿١﴾ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ

ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴿٣﴾ ﴾العصر.

واتە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، بـە دڵنیـایی مـرۆڤ لـە زیانباریی دایـە، {واتـە: لەسـەر بوونەکـەی قـەرزدار دەبێتـەوە}، جارانی دیکەش باسم کردوە: ئێمە بەبێ پرس پێکران هێنراوین بۆ ئێرەو، بێ ئەوەی پرسیشمان پـێ بکـرێ، لێـرە لادەبـرێین، لـە کاتێکی دیارییکراودا، ئنجا مرۆڤ لەسەر بوونەکەی خۆی قەرزدار دەبێتەوە، مەگەر چوار سیفەتی تێدابن:

سـیفەتو مـەرجی یەکـەم: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، جگـە لـە کەسانێك کە ئیمانیان هێناوە، هەمیشە (ءَامَنُواْ) لە قورئانـدا کـە بەکاردەهێنرێ، مەگەر چۆن ئەگـەرنا بـەرکار (مفعولُ بِـهِ)ەکـەی قرتێنـراو (مَحذُوف)ە، چـونکە هـەموو جـارێ نـاکرێ بگـوترێ: (آمَنُـو بِـاللهِ وَمَلائِكَتِـهِ وَكُتُبِـهِ وَرُسُلِهِ وَاليَومِ الأَخِـرِ)، کەواتـە: ﴿ ءَامَنُواْ ﴾، یـانی: ئیمانیـان هێنـاوە بـە هـەموو ئـەو شـتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنـرێ، ئـەوە مـەرجی یەکـەم بـۆ ئـەوەی ئینسان لە زیانباریی دەرباز بێ.

سـيفەتو مـەرجی دووەم: ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، (عَمِلُـوا الصَـالِحَات)یـش دیسـان یـانی: (عَمِلـوا الخِصَـالِ الصَّـالِحَات)، یـانی: هـەموو کـردەوە باشـەکان ئـەنجام دەدەن، ئـەوە مـەرجی یەکەمو دووەم، کە ئەو دووانە لە زاتی خۆماندا دێنـە دی، بـەڵام جارێ ئینسان هـەر بۆتـە نیـوە مسوڵمانو، دوو سـیفەتو مـەرج مـاون، بـۆ ئـەوەی لـە زیانبـاری دەربـازی بێـتو ببێتـە ئـەو مسوڵمانەی کە خوا دەیەوێ.

سیفەتو مـەرجی سـێیەم: ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ﴾، دەبـێ یەکـدیش ڕاسـپێرن بـە هـەق، ئـەو هەقـە کـە لـە ئیمـانو کـردەوەی باشـدا بەرجەستەیە، بیگەیەنن بە دەرەوەی خۆیان.

سـيفەتو مـەرجی چـوارەم: ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾، یەکـدیش ڕاسپێرن بە خۆڕاگریی، چونکە پابەندی بە هەقـەوە، پێویسـتیی بە پشوو درێژیی‌و خۆڕاگری دەکات.

**کەواتـە: ئـەم سـوورەتی (العصـر)ە، کـە سـوورەتێکی مەککەییـە، خـوای کـارزان‌و پـەروەردگار هـەر لـە مەککـە مسـوڵمانانی حـاڵی کردوە، کە دەبێ یەکدی ڕاسپێرن بە هەق‌و، یەکدی ڕاسـپێرن بـە خۆڕاگریی‌و دان بەخۆداگرتن لەسەر شوێنکەوتنی ئەو هەقە.**

## تەوەری سێیەم

# پلەو پایەی بانگەوازکاران

ئایا کەسانێك کە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکەنو، خەڵك بۆ لای ئایینو بەرنامەی خوا بانگ دەکەن، چ پلـەو پایەیـەکیان هەیـەو، چ مەقامێکیان هەیە؟.

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە با سەرەتا سەرەنجی ئـەم ئایەتـە بـدەین، خـــوا دەفـــەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾﴾فصلت.

پێویسـتە بزانـرێ کـە دیـارە لـە هـەموو زمانەکانـدا، شـێوازی دەربڕین مەرج نیە تەنیا شێوازی ئاسایی بێ، جاری وایە شێوازی پرسیار کردنە، جاری وایـە شـێوازی پرسـیارکردنی ئاساییە, یـان پرسـیار کردنـی نکوولێیلێکەرانـە (الإسـتِفهَامُ الإنکَـاري)یــە، لێرەش خوا سبحانە وتعالی بە شێوازی پرسیار کردن، دەفەرموێ:

﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾، قسەی کێ باشترە لە هی کەسێك کە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکات؟ واتە: قسەی کەس باشتر نیە لەوە، چونکە پرسیار کردنی نکوولێیلێکەرانە (الإستِفهَامُ الإنكَاري)، وەڵامەکەی لە نێو خۆی دایە (يَتَضَمَّنُ جَوَابَهُ فِي طَيَّاتِهِ)، پێویستی بە وەڵام ناکات، بۆ نموونە: ئەگەر گوتم: ئایا ئەوە پەرداخ نیە؟ مەبەستم ئەوەیە کە نابێ کەس نکوولێی لێ بکاتو، پێویست ناکات، بڵێم: با، چونکە وەڵامەکەی لە نێو خۆی دایە.

خوا عزوجل دەفەرمویٚ: قسەی کێ چاکترە لە هی کەسێك, کە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکات؟

بە تەئکید هیچ قسەیەك لەو قسەیە باشتر نیە، کەواتە: باشترین قسە، باشترین کەس دەیکات، خوشكو برا خۆشەویستەکانم! باشترین قسە، باشترین کەس دەیکاتو، باشترین کردەوە لە باشترین کەسەوە پەیدا دەبێ، ئینسان دەبێ زۆر دڵی بە خۆی

خۆشبێ، ئەگەر بەڕاستی بانگەوازکاربین بۆ لای خواو، بۆ لای ئایینو بەرنامەو پەیامی خوا، چونکە ئەو قسەیە کە ببێتە هۆی ئەوە خەڵك بەرەو خوا بێو لە خوا نزیك بێتەوە بەندەی خوا بێو، پابەندی شەریعەتی خواو، شوێنکەوتووی پێغەمبەری پێشەوا بێ، ئەو قسەیە, یاخود ئەو کردەوەیە باشترین قسەو کردەوەو ڕەفتارە، کەواتە: خاوەنەکەشی باشترین کەسە.

بەڵام بێگومان کار تەنیا هەر ئەوە نیە خەڵك بانگ بکات بۆ لای خوا، بەڵکو دەبێ کردەوەی چاکیشت هەبێ: ﴿ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾، چونکە بە تەئکید کەسێك قسەی باش بکات، بەڵام کردەوەکەی خراپ بێ، لە جیاتی ئەوەی خەڵك بە قسەی وی لە خوای نزیك بێتەوە، لێی دوور دەکەوێتەوە، چەندان کەسیان بینیوە کە قسەیان باشە، بەڵام کردەوەیان خراپە، خەڵك بە هۆی وانەوە دینی لەبەر چاو دەکەوێ!

بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾، هەروەها کردەوەی چاکیش بکات.

هەروەها مەرجێکی دیکەشی پێویستە: ﴿ وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾، بشلێ: من لە مسولْمانانم، واتە: بە هۆی ئەوەی کە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکات، خۆی پێ لە موسولْمانان زیاد نەبێ، بە خەیاڵو، وەهمی خۆی، بچێتە بورجێكو لەسەرێ ڕا تەماشای خەڵکی بکات! وەك زۆرجاران گوتوومە: مامۆستایەك کە دەچێتە سەر مینبەر، نابێ شەیتان فێڵی لێ بکاتو کڵاوی لەسەر بنێ بڵێ: مامۆستا! تۆ مادام لەسەر مینبەریو ئەو خەڵکە هەمووی لە خوار تۆیە، بێگومان تۆ لە سەرووی هەموانەوەی، کەچی ڕەنگە هەموویان لەوی مسولْمانی باشتر بن، ئەگەر ئەو قسانەی کە مامۆستا دەیانکات، ئەوانەی کە گوێیان لێیانە، هەموویان لە مامۆستا باشتر کاریان پێ بکەن، هەموویان لەو باشترن!

کەواتـــەی: ﴿وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾، وە دەڵـــێ: مـــن لـــە

مسوڵمانانم، واتە: خۆی لەوان جیاناکاتەوە.

ئـــەم فەرمایشـــتەی پێغەمبـــەریش ﷺ پێگـــەو پایـــەی

بانگەوازکارانمان چاك بـۆ ڕوون دەکاتـەوە، کـە دەفـەرموێ: {مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى, كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلاَلَةٍ كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا}[١١].

واتـە: هـەر کەسـێك خـەڵك بـۆ هیدایـەتی خـوا بـانگ بکـات، بـە قەدەر هەموو ئەوانەی کە شوێنی دەکەون، پاداشتی هەیە، بـەبێ ئەوەی کە لە پاداشـتی ئـەوان کـەم بێتـەوە، هـەر کەسـێك خـەڵك بەرەو گومڕایی بانگ بکات، بـە قـەدەر گونـاهی هـەموو ئەوانـەی کە گومڕایان دەکات گوناهبار دەبێ، بەبێ ئـەوەی کـە لـە گونـاهی ئەوانیش کەم بێتەوە.

---

١١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: ٢٠٦٠.

لـه فەرمایشـتێکی دیکەیـدا پێغەمبـەر ﷺ کـە بـە عـەلی کـوڕی ئەبی تاڵیبی فەرموو: {فَوَاللهِ لأَنْ يَهدِي اللهُ بِكَ رَجُلاً, خَيْرٌ لَكَ مِن أَن يَكُونَ لَكَ حُمْر النَّعَمِ}(١٢). واتـە: سـوێند بـە خـوا ئەگـەر خوا بە هۆی تۆوە پیاوێك(١٣) ڕێنمایی بکات (بیهێنێتە سەر ڕێ)، بۆ تۆ چاکترە لەوەی کە حوشتری سوور (یان سپی)ت هەبن.

شـایانی باسیشـە: لـەو ڕۆژگـارەدا: حوشـتری سـپی یـان سـوور باشـترینو بـە نـرخترین مـاڵو سـامانی عـەرەبان بـووە، وەك سەیارەی بەرزترین مۆدیلی ئەم ڕۆژگارەی ئێمە

---

١٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: ٢٩٤٢، وَمُسْلِم برقم: ٢٤٠٦.

١٣) بۆچی فەرموویەتی: پیاوێك؟ دیارە مەجلیسەکە مەجلیسی پیاوان بووە، ئەگەرنا ئەگەر ئافرەتێکیش بە هۆی تۆوە، خوا هیدایەتی بدات, هەمان پاداشت هەر هەیە.

## تەوەری چوارەم

# ئامانج و مەبەستی بانگەواز

**ئایا بۆچی بەڕێزان!**

**خوای پەروەردگار بەر لە هەر کەس, لەسەر پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ پێویستی کردوە، پاشان لەسەر ئۆممەتەکەیو, شوێنکەوتووانیشی فەرزی کردوە, کە خەڵکی (بۆ لای خواو، بۆ لای ئیسلام) بانگ بکەن، بە هەموو شێوازەکانی بانگ کردن - کە دواتر لە تەوەرەکانی دیکەدا باسیان دەکەین - لەبەرچی؟**

**ئەگەر تەماشای چەند دەقێك بکەین, زۆر بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێ, کە مەبەستو ئامانجی بانگەواز چییە:**

**١)- لە سوورەتی (الأنبیاء)دا خوا دەفەرموێ:** ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ۝٢٥﴾، **خوا بە پێغەمبەری پێشەوامان موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: لە**

پـــێش تـــۆدا هـــیچ پێغەمبـــەرێکمان ڕەوان نـــەکردوە، مەگـــەر سروشمان بۆ کردوە، کە جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن.

هەموو پێغەمبەران بۆ ئەوە هاتوون (علیهم الصلاة والسلام)، کـە وەك پەیوەندی بەینی خۆیانو خوا، تەنیا خوا بپەرستن.

٢)- ســـوورەتی (الحدید)یشـــدا خـــوا دەفـــەرموێ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ﴿٢٥﴾﴾، واتـــە: پێغەمبـــەرانمان بـــە بەڵگـــە ڕۆشـــنەکانەوە نـــاردوونو، کتێـــبو تـــەرازووشمان لەگـــەڵ ناردوونـــە خـــوار، تـــاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوەبچێ...

هەڵبەتـــە ئـــەو دووەش تێکنـــاگیرێن، وەك پەیوەنـــدیی نێـــوان خۆمـــانو خـــوا، پێغەمبـــەران بـــۆ ڕاگەیانـــدنو چەســـپاندنی تـــەنیا خوا پەرستن (توحیـد الله) هـاتوون، بـەڵام بـۆ پەیوەنـدیی نێوان

خۆمـانو خۆمـان، بـۆ ئـەوە هـاتوون کـە خـەڵك بـە دادگـەریی بەڕێوەبچنو، دووربن لە ستەمو جەورو تاوانو لادان.

٣)- ئنجا با تەماشای ئـەم ئایەتـە موبارەکـەی سـوورەتی (التوبـة) بکــەین، کــە خــوا دەفــەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾﴾، واتـــــە: بڕواداران نابێ هەموویان تێکرا بڕۆن بۆ جەنگو جیهاد، بـەڵکو دەبـێ لـە هـەر کۆمـەڵێکی زۆریـان دەسـتەیەکیان دەربچـن، بـۆ تێگەیشـتن لـە ئـایین، (واتـە: هـەموویان نـابێ بـەس سـەرگەرمی جـەنگو جیهـاد بـن، بـەڵکو دەبـێ لـە هـەر کۆمـەڵێکی زۆریـان، دەستەیەکیان کەمێکیان خەریکی تێگەیشتن لە ئایین بن)، بـەڵام ئایا بۆچی لـە ئـایین تێبگـەن؟ ﴿وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾، تـــاکو خەڵکەکـــەیان بترســـێننو هۆشـــیار

بکەنــەوە کاتێـك دەگەڕێنــەوە بـۆ لایـان، تـاکو ئـەوانیش وریـایی خۆیان وەربگرنو، {بزانن بۆچی هاتوون بۆ دنیاو دەبێ چۆن بژینو چی بکەنو چۆن بکەن؟}

کەواتە: دیارە ئامانجی بانگەواز چییە؟

٤)- هەروەها با تەماشای ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر بکەین ﷺ، کەپێغەمبەری خوا یەکێك لە شێوازەکانی تێگەیاندنی خەڵك لە ئیسلامی، ئەوە بووە, کە شتی بۆ وێنا کردوونو، وێنەی بۆ هێناونەوە، کە ئەویش لە خوای پەروەردگارەوە فێر بووە، کە فەرموویەتی: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَـٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَـٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾العنكبوت، واتە: ئەو وێنانەش بۆ خەڵك دێنینەوە، بەڵام تەنیا زانایان لێیان تێدەگەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ وێنەیەك دێنێتەوە:

{عَنْ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ الأَنْصَارِيِّ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً صِرَاطَاً مُسْتَقِيمًا وَعَلَى جَنْبَتَيْ الصِّرَاطِ

سُورَانِ, فِيهِمَا أَبْوَابٌ مُفَتَّحَـةٌ، وَعَلَـى الأَبْـوَابِ سُتُورٌ مُرْخَـاةٌ, وَعَلَى بَابِ الصِّرَاطِ دَاعٍ يَقُولُ: أَيُّهَا النَّـاسُ! ادْخُلُوا الصِّـرَاطَ جَمِيعًا وَلاَ تَتَعوَّجُوا وَدَاعٍ يَدْعُو مِنْ فَوْق الصِّـرَاطِ، فَـإِذَا أَرَادَ يَفْتَحُ شَيْئًا مِنْ تِلْكَ الْأَبْـوَابِ, قَـالَ: وَيْحَكَ! لاَ تَفْتَحْـهُ, فَإِنَّكَ إِنْ تَفْتَحْهُ تَلِجْهُ!

وَالصِّرَاطُ: الإِسْلاَمُ

وَالسُّورَانِ: حُدُودُ اللَّهِ تَعَالَى

وَالأَبْوَابُ الْمُفَتَّحَةُ: مَحَارِمُ اللَّهِ تَعَالَى.

وَذَلِكَ الدَّاعِي عَلَى رَأْسِ الصِّرَاطِ: كِتَابُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.

وَالدَّاعِي فَوْقَ الصِّرَاطِ: وَاعِظُ اللَّهِ فِي قَلْبِ كُلِّ مُسْلِمٍ}[١٤].

**نەوواسی کوڕی سەمعانی ئەنصاریی خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا وێنەیەکی هێنایەوە: ڕێیەکی ڕاست، خەتێکی ڕاست، هەردووك لای ئەو خەتە ڕاستە، دوو دیوار هەن, ئەو دوو دیوارانە دەرگایان تێدان، دەرگاکان کراونەوەو، ئەو دەرگایانە کە کراونەوە، پەردەیان پێدا**

---

١٤) أَخْرَجَهُ أَحمَد: ١٧٦٧١، وَالنَّسائي فِي الكُبرى، ج٦ ص٣٦١، والحاكم فِي المُستَدرَك: ١٤٤٨، وَقَالَ: هذَا حديثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرطِ مُسلم ولا يَعرِفُ عَلَيهِ عِلَّةٌ، وَلَم يُخرِجاهُ وَأَقَرَّهُ الذهَبِي في التلخِيص, وَصَحَّحَهُ الألباني في "صَحِيحِ الجَامِع" برقم: ٣٨٨٧.

شـــۆڕكراونەوە، {دەرگاكـــان كراونـــەوە، بـــەڵام پـــەردەيان پێـــدا دراون} ، ئنجا لەسەر دەروازەكەی ئـەو ڕێگايـە, بانگكـەرێك بـانگ دەكـات، دەڵـێ: خەڵكينــە! هــەمووتان بەڕێيەكــەدا بــڕۆن‌و، لار مـەبن، (واتـە: لامـەدەن بـەلای دەرگاكانـداو، بەخەتـە ڕاسـتەكەدا بڕۆن)، بانگكەرێكی ديكەش لە سەرووی ڕێگەكەوە بـانگ دەكـات، {يــەكيان لــە كۆتاييەكــەی‌و يــەكيان لــە ســەرەتايەكەی بــانگ دەكـات} ، ئنجـا هـەر كـاتێ مـرۆڤ ويسـتی يـەكێ لـەو دەرگايانـە بكاتەوەو بيچێتە نێوی، دەڵێ: نەكـەی، مەيكـەوە! چـونكە ئەگـەر بيكەيــەوە، چــيەتێی، {جــا دوايــی بۆمــان ڕوون دەكاتــەوەو، دەفەرموێ:}

ڕێبازەكە، (خەتە ڕاستەكە): بريتيە لە ئيسلام.

دوو ديوارەكان: بريتين لە سنوورەكانی خوا.

دەرگا كراوەكان: بريتين لە قەدەغە كراوەكان.

ئەو بانگكەرەی كە لە دەروازەو سەرەتای ڕێيەكەيە: ئـەوە كتێبـی خوايە.

ئـــەوەش کـــە لـــە کۆتـــایی‌و پشـــتەوەی ڕێگاکەیـــە، ئـــەوە ئامۆژگەرییکاری خوایە، لە دڵی هەموو ئینسانێکی مسوڵماندا.

ئەو ئیمانەی کە لە دڵتدایە, جاری وایـە مـەرجیش نیـە ئایـەتت لـە بیربـێ‌و، بـۆت بخوێنرێتـەوە، لـە دڵـی خۆتـداو لـە دەروونـی خۆتدا فەرق بە حەڵاڵ‌و حـەڕام‌و، چاکەو خراپـە دەکـەی، بـەڵام وەك پێغەمبەر ﷺ بە وابیصـەی فـەرموو: {يَـا وَابِصَـةُ اسْتَفْتِ نَفْسَكَ}[١٥]، واتە: (وابیصە یەكێك بووە لـە هـاوەڵان، بـەڵام دیـارە كەسێكی چاك‌و خوا ناس بووە، وەك هـەموو هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بێ.

واتە: ئەی وابیصە ! پرس بە دڵی خۆت بکە، واتە: پرس بە دڵـی خۆت بکە، داخۆ ئەو شتە چۆنە؟ جاری وایە کەسێك دێ بـۆ لام, دەڵێ: ئەرێ مامۆستا! ئـەو شـتە چۆنـە؟ ئـەو مامەڵەیـە دەکـەم، ئەو کردەوەیە ئەو ڕەفتارە، حوکمەکەی؟!

١٥) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: ١٨٠٣٠.

منیش دەڵێم: تەماشای دڵی خۆت بکە، دڵت چۆنە، ئایا لێی مورتاحە؟ بەڵام مەرجیش نیە بۆ هەموو کەس وابێ، پێغەمبەریش ﷺ بە وابیصەی وافەرموو، ئەگەرنا هی وا هەیە دڵەکەی مردووەو، فەرق بە حەڵاڵو حەرامو, بە چاکەو خراپە، ناکات، بۆیە نابێ ئینسان شەیتان کلاوی لەسەر بنێو، پێی وابێ هەرچی بە دڵ پێی چاك بوو، بڵێ: دیارە چاکە!! وەك زۆرجاران دەبیستم دەڵێن: فلانکەس ئیجتیهادی کردوە، دەڵێم: ئیجتیهاد هەیە، بەڵام ئیشتیهاش هەیە، ئیجتیهاد ئەوەیە لە سنووری شەریعەت دابێ، ئیشتیهاش ئەوەیە کە لەگەڵ دەقەکانی شەریعەتو لە چوارچێوەی شەریعەت، بە دەربێ، پێخۆش بوون، جیایە لە کۆششکردنو تێگەیشتن.

ئنجا خوشكو برا خۆشەویستەکانم!

ئامانجو مەبەستی بانگەواز دەتوانین بڵێین، دوو شتی بنەڕەتییە:

یەکەم: خواپەرستیی‌و خوا بە یەکگرتن، هەر وەك خوا سبحانە وتعالی لەسەر زمانی هەر کام لە نووح‌و هوود صالح‌و شوعەیب سەلامی خوایان لێ بێ، لە سوورەتی (الأعراف)، لە ئایەتەکانی (٥٩و٦٥و٧٣و٨٥)دا، یەك ڕستە دووبارە دەکاتەوە: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ﴾، ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە.

هەڵبەتە بەندایەتیی کردن بۆ خواو، بەتەنیا خوا پەرستن، هەموو شتەکانی دیکە دێنێتەوە نێو خۆی، چونکە ئەگەر تۆ بەڕاستی خوات پەرست، دەپرسی بزانی داخۆ ڕێیە ڕاستەکەی خوا کامەیە؟ کتێبی خوا چی فەرمووە؟ ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ چی تێدایە؟ ئەگەر بەڕاستی ڕووت لە خوا پەرستیی کرد، ئەو ئیمانەت هیدایەتت دەدا، لە مەسەلەی حەلاڵ‌و حەرام، چاکەو خراپەو، هەڵس‌و کەوتی نێو کۆمەڵگادا، چی بکەی‌و چۆن

**بكـــەی؟ وەك خـــوا فەرموويـــەتی:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ

ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْ ﴿٩﴾ ﴾ **يونس.**

**دووەم: پـارێزران لـە سـزای خـوا بـە هـۆی پـارێزران لـە لادانو تاوانەوەو، سەرەنجام سەرفرازیی، بـەڵێ: مەبەسـت لـە ئامـانج لـە بانگـەواز، بريتيــە لــە بەندايــەتی كــردن بــۆ خــوا، شــوێنكەوتنی پەيامو شەريعەتی خواو، شوێن پـێ هـەڵگرتنی پێغەمبـەری خـوا ﷺ كە ئەنجامەكەی ئەوەيە لە دنيـادا، ئينسـان لـە لادانو تـاوان دەپارێزرێو، لـە دوارۆژيشـدا بـە هـۆی ئـەوەوە سـەرفراز دەبـێو, ڕەزامەنديی خوای پەروەردگار وەدەست دێنێ.**

## تەوەری پێنجەم

## ڕێبازی بانگەوازو، شێوازو ئامانجەکانی

بەڕێزان!

لـەم تـەوەرەدا باسـی ڕێبـازی بانگـەوازو، شـێوازو ئامانجـەکانی دەکەین، چونکە هەر کارێك بویسترێ ئـەنجام بـدرێ، بـە تەئکیـد دەبـێ خـەفتانی بـۆ بکـرێ، تـاکو بزانـرێ بـە چ ڕێیەکـداو، بـە چ شێوازێك، بە چ ئامرازێك پیادەی بکرێ؟

کەواتە: ئێمە سێ وشەمان هەن، واتاکانیان لێك نزیکە.

یەکەم: ڕێباز.

دووەم: شێواز.

سێیەم: ئامراز.

بگرە تاکو ڕاددەیەك هەندێ تێهەڵکێشییشیان بەیەکەوە، هەیە:

**یەکەم: ڕێباز:**

**وشـەی (ڕێبـاز) لـە بەرانبـەری (مـنهج)و، (منهـاج)ی عەرەبیـدا بەکاردێ، (النَّهْجُ وَالمِنْهَاجُ: يَعْنِـي: الطَّرِيقُ الوَاضِـح) ڕێیـەکی ڕوونو ڕۆشن.**

**دووەم: شێواز:**

**وشــەی (شــێواز) لــە عەرەبیــدا بەرانبــەر وشــەی (أســلوب) بــەکاردەهێنرێ، ئــەویش بریتیــە لــە ڕووی شــتێكو شــێوەی ئەنجامدانی کارێك.**

**سێیەم: ئامراز:**

**وشـەی (ئـامراز)یش بـە مانـای پلـە، نیزیکیـی، هـەروەها هـەر هۆکارێك دێ، کە ئینسان ئامانجی پێ وەدەست دێنێ.**

**١)- ڕێبازی بانگەواز کردن بۆ لای خوا: مەبەست پێی ئەو بنەماو پێـوەرو نەخشـانەن، کـە بابـای بانگـەوازکار دەیانگرێتـە بـەر، لـە پرۆسەی خەڵك بانگ کردن بۆ لای خوادا.**

٢)- <u>شـێوازی بانگـەواز کـردن</u>: بریتیـە لـەو ڕێبـازو شـێوەیەی کـە بابای بانگەوازکار دەیگرێتە بەر، ڕێباز (منهج) گشتییە، ئنجا لـە نێـو ئـەو ڕێبـازەدا، دەگـونجێ بـە چـەند شـێوازێك ئـەو پرۆسـەی بانگکردنە ئەنجام بدرێ.

٣)- <u>ئامڕازەکانی بانگەواز</u>: بریتین لەو هۆکارانـەی چ مـاددیی بـن، چ مەعنەویی، کە بابای بانگەوازکار بەکاریان دێنێ بە شـێوازێکی تایبەت، بۆ ئەوەی بەو ڕێبازەدا، کـە گرتوویەتـە بـەر، خـەڵك بـۆ لای خوا بانگ بکات.

کەواتـە: وشـەی ڕێبـاز چـوار چـێوە فراوانەکەیـە، شـێواز بریتیـە لەوەی لە نێو ئەو ڕێبازەدا چەند شێوەو شـێوازێك بگیرێنەبـەرو، ئامڕازەکانیش بریتین لەو هۆکارە ماددی مەعنەوییانەی ئینسان دەیانگرێتە بەر[١٦] بۆ ئەنجامدانی کارەکەی.

---

١٦) فقه دعوة غير المسلمين، ص٤٠، ٤١، ٤٩.

**بـۆ وێنــه: خـوای پــەروەردگار دەفـەرموێ:** ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ١٢٥ ﴾النحل.

**هەڵبەتـە ئێمـە دواتـر ئـەم ئایەتـە شـیكردنەوەی زۆری لەسـەر دەكـەین، لێـرە كـە دەفـەرموێ: بـەرەو ڕێبـازی پـەروەردگارت بـە حیكمەت خەڵك بانگ بكە.**

**ئەمە ڕێبازەكەیە، چونكە وەك دوایی باسی دەكەین، لە ڕاسـتییدا ڕێبازی بانگ كردنی خەڵك بۆ لای خـواو، ئـایینی خـوا، هـەمووی لە وشەی حیكمەتدا كۆدەبێتـەوە: چـونكە ئـەوە هـەر دەچـێتەوە نێو وشەی حیكمەت، كە تـۆ وەك چـۆن عـەقڵی خـەڵك دەدوێـنی، دڵیشیان بجووڵێنی، واتە: هەم هەوڵبدەی عـەقڵیان قەناعـەت پـێ بێنی، هەم دڵو دەروونیشـیان بجووڵێنی، هـەروەها ئـەوەش هـەر دەچـێتەوە نێـو حیكمـەت: كەسـێك كـە ڕێـی نكـووڵیی و كەللـە**

**ڕەقیی بگرێتە بەر، هەوڵبدەی بە باشترین شێواز دەم کوتی بکەی‌و بێدەنگی بکەی، (وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ).**

**کەواتە: ڕێبازەکە:** ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴿١٢٥﴾ ﴾.

**بەڵام بێگوان شێوازەکەی دەگونجێ زۆر شێواز بگیرێتە بەر، بۆ وێنە:**

**١)- خوای کاربەجێ بەسەرهاتی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ دەگێڕێتەوە، پانتاییەکی زۆر لە قورئاندا بۆ بەسەرهاتی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ دانراوە.**

**٢)- خوای تاك‌و پاك وێنان دێنێتەوە، وەك خوا لەبارەی ئامانج‌و حیکمەتی ئەو بەسەرهاتانەشەوە فەرموویەتی:** ﴿ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ ﴿١١١﴾ ﴾**یوسف، فەرموشیەتی:**

﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَـٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَـٰلِمُونَ

﴿٤٣﴾ ﴾العنكبوت.

**كه دەتوانین ئاماژە بە هەندێکیان بکەین:**

١)- ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ

ٱلْعَنكَبُوتِ ﴿٤١﴾ ﴾ العنكبوت.

٢)- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ

تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ﴿٧٣﴾ ﴾ الحج.

٣)- ﴿ أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ

مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٢﴾ ﴾الملك.

٤)- ﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَـٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى

ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَـٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ﴿١٢٢﴾ ﴾الأنعام.

**هەروەها زۆر وێنەی دی.**

٣)- شـێوازێكی دیكـه بریتیـه لـه دڵخۆشـكردنیان بـه پاداشـتو چاكەی خوا، له دنیاو دوارۆژدا.

٤)- شـێوازێكی دیكـه بریتیـه لـه ترسـاندنیان لـه ترسـاندنو هەڕەشەی خوا.

٥)- شێوازێكی دیكەش بریتیـه لـه بیرخسـتنەوەی نیعمەتـەكانی خوا.

ئامرازەكانیش زۆر جۆراوجـۆرن، بـۆ وێنـه: دوانـدن نامـه نـاردن، بەكارهێنانی تەكنەلۆژیا (ڕادیۆ، تیڤـی، تـۆڕە كۆمەڵایەتییـەكان)، وتار دان بەڵام باشترین شێوازو ئامرازی بانگەواز ئەوەیە كە ئـەو شـتەی دەتـەوێ لـه خەڵكـه بگەیـەنیو بانگیـان بكـەی بـۆی: لـه خۆتـدا بەرجەسـتەی بكـەی، ئـەوە گۆیـاترینو ڕەوانـترین زمانـه، وەك دوایی له تەوەرەكانی دیكەدا باسی لێوە دەكەین.

ئێستاش دوای ئـەوەی بـه كـورتییو ئامـاژە ئاسا هـەوڵی پێناسـه كردنی هـەر كـام لـه: ڕێبـازی بانگـەوازو، شـێوازەكانی بانگـەوازو،

ئامرازەكانی بانگەوازماندا، با وردترو ڕوونتر تیشكیان بخەینە سەر:

## ١)- ڕێبازی بانگەواز:

من پێم وایە ڕێبازی بانگەواز (منهاج الدعوة) لە هێڵە گشتییەكاندا، ئەم ئایەتە موبارەكە لە خۆیدا كۆی دەكاتەوە:

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٢٥ ﴾النحل، واتە: بە حیكمەتو ئامۆژگاریی باش بانگ بكە بۆ لای ڕێبازی پەروەردگارت، ( ٱدۡعُ ) بەكار (مفعول بە)ەكەی قرتێنراو (محذوف)ە، یانی: خەڵك بانگ بكەو، جند بانگ بكە، بۆ كوێیان بانگ بكە؟ (إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ ) بۆ لای ڕێبازی پەروەردگارت، ڕێبازی پەروەردگاریش، بە دڵنیایی ئەو ئایینەیە كە خوا بە پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ ناردوویەتی، كە هەر ئەو

ئايینـه بـه هـهموو پێغهمبـهرانی دیكهشـدا نێـردراوه، بـهڵام دوا نوسخهی هیدایهتی خوا، به پێغهمبـهر ﷺی خاتهمـدا نێـرراوه، كـه ئـهوهی تێـدا لهبهرچـاودا گـیراوه: بـه كـهڵكی هـهموو مرۆڤایهتیی بێ به پانایی زهمینو، به درێژایی زهمان، چونكه له دوای موحهممهد ﷺ پێغهمبهرێكی دیكه نایهت، ئنجا ئایا چۆن خهڵك بانگ بكهین بۆ لای ڕێبازی پهروهردگار؟

خوا دوو وشـهی بـهكارهێناون: ﴿بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ﴾ (بـه حیكمهتو، ئامۆژگاریی چاك) چـونكه مـرۆڤ دوو جیهـازی هـهن كه دهیجووڵێنن: (عهقڵ)ی و (دڵ)ی، ئـهوهی كـه مـهحوی شـاعیر دهڵێ:

سهر كه هۆشێـكی نهبێ زڕكه تـــــاڵم بۆ چییه؟

دڵ كه جۆشێكی نهبێ شووشهی بهتاڵم بۆ چییه؟

هـهردووكیان: عـهقڵو، دڵ، كاریگـهریان ههیـه لهسـهر مرۆڤــ، چ بهباری خێردا، چ بهباری شـهڕدا، جاری وایـه ئینسان بـه عـهقڵ شـتێك دهزانـێ، بـۆ وێنـه: كهسێك كـه جگـهره دهكێشـێ، دهزانـێ

خراپـه، یـان کـه شـەڕاب دەخواتـەوە، بـە عـەقڵ دەزانـێ خراپـە، بەڵام بۆچی دەیکێشێ، یان دەیخواتەوە؟ چـونکە دڵەکـەی لەگـەڵی نایە!

کەواتە: ئینسان هەر عەقڵی ڕووت نیـەو، مـەرج نیـە ئینسـان کـە شـتێکی زانـین یەکسـەر بشـیتوانێ، بۆیـە زۆرجـاران مـن دەڵـێم: (ئینسان دەبـێ هەوڵبـدات زانینەکـەی لـە خۆیـدا بکاتـە تـوانین)، (حاڵی بوون لە خۆیدا بکات بە حاڵ).

ئێستاش با بـۆ زیـاتر لێتێگەیشـتنی ئـەم ئایەتـە بـە پێـزە سـەرو تیشـك بخەینـەر سـەر هـەر کـام لـە وشـەکانی: (الحكمـة) و (الموعظة الحسنة) و (الجدال بالتي هي أحسن)

**١) ماناى وشەى:** (بِٱلۡحِكۡمَةِ )

**پێناسەى حيكمەت:**

**حيكمەت پێناسەى زۆرى بۆ كراوە، بەڵام هەندێ لە پێناسەكانى، ئەمانەن:**

١- {الحكمة: الإصَابَةِ فِي العِلْمِ وَالعَمَل}، **حيكمەت: بريتيە لە پێكانو لە نيشاندان لە زانستو كردەوەدا.**

٢- {الحكمة: وَضْعُ الشيءِ قَوْلاً، أَو فِعْلاً فِي مَوْضِعِهِ المُنَاسِب}، **دانانى شتێك بە كردەوە يان بە قسە، لە شوێنى گونجاوى خۆيدا.**

٣- {الحِكْمَةُ: الإتْقَانِ فِي القَوْلِ وَالعَمَل}[17] **حكمەت بريتيە لە وردەكاريى لە قسەو لە كردەوەدا.**

٤- {الحكمة: فِعْلُ مَا يَنْبَغِي عَلَى الوَجْهِ الَّذِي يَنْبَغِي فِي الوَقْتِ الَّذِي يَنْبَغِي}[18] **واتە: حيكمەت بريتيە لە:**

---

١٧) **پێناسەكانى يەكەمو دووەمو سێيەم:** المعجم الوسيط: ١٠٥٨.
١٨) مدارج السالكين، ج١ ص ٤٧٩.

**کردەوەیەك(١٩) کە پێویستە، بەو شێوازەی کە پێویستە، لەو کاتەدا کە پێویستە.**

**منیش حیکمەتم لە زمانی کوردییدا بە (کارامەیی) و (دانایی) و (لێزانیی) لێکداوەتەوە.**

**٢ ) مانای وشەی:** ﴿وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ﴾

**پێناسەی:** (الموعظة الحسنة):

{المَوعِظَةُ أَو الوَعْظُ: وَهِيَ المَقَالَة المُشْتَمِلَة عَلَى الموعظة الحَسَنَة الَّتِي يستحسنها السامع، وَتَكُونُ فِي نَفْسِهَا حَسَنَة باعْتِبَار انْتِفَاعِ السَّامِعِ بهَا}[٢٠]، (مَوْعِظَة) و (وَعْظ) **هەر قسەیەکە کە دڵ بجووڵێنێ‌و، هانی بدات، بیوروژێنێ، بە**

---

١٩) **کردەوە مەرج نیە کە تەنها پەیوەندیی بە ئەندامەکانەوە هەبێ، چونکە قسەش بە کردەوە دادەنرێ‌و، نیەتی نێو دڵیش بە کردەوە دادەنرێ، لە بەکارهێنانی قورئان‌و سوننەتدا، بۆیەش زانایان کە پێناسەی ئیمان دەکەن، دەڵێن:** (الإيمان: قول وعمل، قول القلب واللسان، وعمل القلب والجوارح)، **واتە: ئیمان قسەو کردەوەیە: قسەی دڵ‌و زمان‌و، کردەوەی دڵ‌و ئەندامەکان.**

٢٠) فتح القدير ج٣ص٢٠٨.

مەرجێك ئامۆژگاریی باش بگرێتە خۆی، كە بابای بیسەر پێی پەسند بێ‌و لە خودی خۆیشیدا باش بێ لەو ڕووەوە كە بیسەرەكەی لێی بەهەرەمەند بێ.

جێی سەرنج ئەوەیە، كە خوا سبحانه وتعالی وشەی حیكمەتی بە هیچ وەسفێك وەسف نەكردوە: ( ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ ) چونكە: دانایی‌و وەستایی‌و كارامەیی، پێویست بە وەسفێكی دیكە ناكات، بەڵام (الموعضة)ی، بە وەسفی (حسنة) پەیوەست كردوە، چونكە ئامۆژگاری مەرج نیە هەموو دەمێ چاك بێ، وەك عەرەب دەڵێن: {مَنْ وَعَظَكَ فِي مَلأٍ، فَقَدْ شَانَكَ، وَمَنْ وَعَظَكَ فِي خَلاٍ فَقَدْ زَانَكَ} واتە: كەسێ لە نێو خەڵكدا ئامۆژگارییت بكات، ئەوە ناشیرینت دەكات، بەڵام ئەگەر هەركەس تەنیا ئامۆژگارییت بكات، ئەوە جوانت دەكات، یانی: هەموو ئامۆژگارییەك هی نێو خەڵك نیە، جاری وایە تۆ كەسێك، دەیبەیتە پەنایەك‌و ئامۆژگاریی دەكەی: ئاوا نەكەی چاكە، نەدەبوو وابێ، بەو شێوەیەی بەتەئكید لە دڵدا خۆشترە.

**٣ ) ماناى وشەى:** (وَجَـٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ)

ئـەو ڕێبـازەى كـە ئێمـە خـەڵكى بـە گـوێرەى وى بـانگ دەكـەين، بريتيە لە حيكمەتو، بەشێك لە حيكمەتيش ئامۆژگاريى چاكە، ئـەدى ئايـا شـەڕە قسـە بـە باشـترين شـێوە (الجـدَال بـالَّتِي هِـي أَحْسَن) پێگەو شوێنى لە ئيعراِبدا چيە؟

لە ڕاستييدا شەڕە قسە (جدال) لە كاتى ناچاريى دايـە، ئەگـەرنا بابـاى بانگـەوازكار (داعـي) دەبـێ عـەقڵى خـەڵك بـدوێنێو، هەوڵبدات عەقڵيان قەناعەت پێ بـێنێ، ڕاسـتييەكانى ئيسلاميان تێ بگەيەنى، لە ڕێـى بـەكارهێنانى بەڵگـەى عەقڵييـەوە، چـونكە قوڕئان واى كردوە، ئنجا هەوڵبدات دڵيشيان بجووڵێنێ، هەسـتو نەسـتو دڵو دەروونيـان بجـووڵێنى، بـە ئـارەزوو وەبـەرنانو، ترساندنو، هۆشيار كردنەوە، بەڵام جارى وا هەيـە كەسـێك لێـت لە ڕقدا دەچێ، كەللە ڕەقيـىو عينـاديى دەكـات، يـاخود دەيـەوێ پەيامەكـەى تـۆ لەبـەر چـاوى خـەڵك بشـكێنێ، ئـەوەيان شـەڕە قسەى لەگەڵدا بكە، نابێ بێدەنگى بى: (وَجَـٰدِلۡهُم) بەڵام چۆن؟

(بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ) به باشترین شێواز ئامۆژگاریی ئەوەنـدە بەسـە

کە بە شێوەیەکی باش بێ، بەڵام مشتو مڕو شەڕە قسە (جـدال)

دەبێ بە باشترین شێوە بێ، هەڵبەتە دوایی ئەو باشترین شێوەیە،

لە حەوت کورت خاڵدا باس دەکەین، لە تەوەرەیەکی دیکەدا.

ئەوە بە نسبەت ڕێبازی بانگەوازەوە.

## ٢- شێوازەکانی بانگەواز:

ڕێبازی بانگەواز - وەك پێشتر گوتمان هەر یەکێکەو نەگۆڕە، ئایـا

ئەگەر دنیا بگۆڕێ دەشێ بە ناشایستەییو ناکارامەیی خـەڵك بـۆ

لای خوا بانـگ بکـەی؟ ئایـا دەگـونجێ عـەقڵیان نـەدوێنیو، هـەوڵ

نەدەی دڵیان بجووڵێنی؟ نـەخێر، هـەرگیز نـابێ، دەبـێ بانگـەواز

هـەر بـەو شـێوەیە بـێو گـۆڕانی بەسـەردا نایـەت، بۆیـە هـەر

لەسەرەتاوە گوتمان: ڕێبـازی بانگـەواز گـۆڕانی بەسـەردا نایـەتو،

ئامـانجی بانگـەوازیش کـە (خـەڵك لـە خـوا نیزیـك خستنەوەیە)

**هەرگیز گۆڕانی بەسەردا نایەت، بەڵام ئەوەی گۆڕانی بەسەردا دێ، شێوازو ئامرازەکانن.**

**ئێستاش با سەرنجێکی شێوازەکانی بانگەواز بدەین:**

**<u>یەك</u>: جاری وایە بە شێوازی تاکیی خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکرێ، وەك پێغەمبەری خوا ρ موعازی کوڕی جەبەل لەگەڵیدا سواری گوێدرێژ بووە، فەرموویەتی:** {یَا مُعَاذُ، أَتَدْرِي مَا حَقُّ اللهِ عَلَى الْعِبَادِ؟ قَالَ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: أَنْ يُعْبَدَ اللهُ وَلاَ يُشْرَكَ بِهِ شَيْءٌ، قَالَ: أَتَدْرِي مَا حَقُّهُمْ عَلَيْهِ إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ؟ فَقَالَ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمْ»[٢١]}.

**واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی موعاز، ئایا دەزانی مافی خوا بەسەر بەندەکانیەوە چییە؟ گوتی: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ئەوەیە کە خوا بپەرسترێ‌و هیچ هاوبەشێکی بۆ دانەنرێ، فەرمووی: ئایا دەزانی مافی ئەوان بەسەر خواوە چییە، ئەگەر ئەوەیان جێبەجێ کرد؟ گوتی: خواو**

---

٢١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: ١٥٤.

پێغەمبەرەكەی زاناترن، فەرمووی: (مافیان لەسەر خوا) ئەوەیە كەوا هیچ سزایەكیان نەدات.

دوو: جاری واش باشە بە كۆمەڵ خەڵك بانگ بكرێ، وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارەكانی ڕۆژانی جومعە و جەژنەكانو حەمج و عومرەو ... هتد خەڵكی بانگ كردوە.

سێ و چوار: بانگ كردن بە ئاشكرا یان بە پەنهانیی، وەك نووح سەلامی خوای لێبێ دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ۝٨ ثُمَّ إِنِّيٓ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ۝٩ ﴾نوح، چونكە جاری وایە بە ئاشكرا پێویست دەكاتو، جاری واشە بە پەنامەكییو پەنهانیی بانگەواز كردنەكە باشتر ئامانج دەپێكێ.

پێنج: شێوازی بەسەرهات گێڕانەوە، وەك خوای كاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ ٱلۡقَصَصِ بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ ۝٣ ﴾یوسف، واتە: ئێمە بە هۆی ئەوەوە كە ئەم

**قورئانــەمان بــۆ لات ســروش کــردوە، باشــترین گێڕانــەوەت بــۆ دەگێڕینەوە.**

**شەش: وێنە هێنانەوە** (ضرب الأمثال)**، کە پێشتریش باسمان کرد.**

**حەوت: دواندنی عەقڵو جووڵاندنی دڵو ویژدان.**

**هەشت: پرسیار کردن، وەك لـەم فەرموودەیـە هاتوە:** {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، لَمَّا نَزَلَتْ: وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ وَرَهْطَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ، خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ρ حَتَّى صَعِدَ الصَّفَا، فَهَتَفَ: يَا صَبَاحَاهُ، فَقَالُوا: مَنْ هَذَا؟ فَاجْتَمَعُوا إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ خَيْلاً تَخْرُجُ مِنْ سَفْحِ هَذَا الْجَبَلِ، أَكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ؟ قَالُوا: مَا جَرَّبْنَا عَلَيْكَ كَذِبًا، قَالَ: فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ، قَالَ أَبُو لَهَبٍ: تَبًّا لَكَ مَا جَمَعْتَنَا إِلاَّ لِهَذَا؟ ثُمَّ قَامَ، فَنَزَلَتْ: تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَقَدْ تَبَّ هكَذَا قَرَأَهَا الأَعْمَشُ يَوْمَئِذٍ}[٢٢].

٢٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: ٤٦٨٧.

واته: ئیبنو عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾الشعراء، پێغەمبەری خوا دەرچوو هەتا ڕۆیشتە سەر كێوی صەفا، ئنجا بە دەنگی بەرز بانگی كرد: ئەی بەرەبەیان هاوارە! گوتیان: ئەوە كێیە! ئیدی لێی كۆبوونەوە، ئەویش فەرمووی: ئەگەر هەواڵتان بدەمێ كە ئەوە خەریكە سوپایەك لەم دامێنی چیایەوە بەسەرتاندا بدات، ئایا بڕوام پێدەكەن؟ گوتیان: (بەڵێ) درۆمان لێ نەبیستووی، فەرمووی: دەجا من ترسێنەرتانم لە پێش دەستی سزایەكی سەختەوە، ئەبو لەهەب گوتی: ئایا تەنیا بۆ ئەمە كۆت كردبووینەوە؟ دوایی ڕۆیشتو (تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ) دابەزی.

<u>نۆ</u>: لێ توورە بوونو سەرزەنشتكردن، وەك ئوسامەی كوڕ زەید لە جەنگێكدا یەكێك دەكوژێ، دوای ئەوەی ئەو كەسە شایەتمانی هێناوە، دوایی كە پێغەمبەری خوا ρ بەسەرهاتەكە دەبیستێتەوە بە سەرزەنشتەوە دەفەرموێ: {أَقَتَلْتَهُ بَعْدَ مَا قَالَ

**لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ}[٢٣]. واته: هەر کوشتت، دوای ئەوەش کە گوتی: (لا إله إلاّ الله)؟ ئەویش گوتی: لە ترسان وای گوت، فەرمووی: ئایا دڵت لەت کردبوو، مەبەستی ئەوەیە تۆ نێو دڵت نەخوێندبۆوە، تاکو بزانی ڕاستی دەکرد، یان درۆ!! لێرەشدا شێوازەکە، شێوازی سەرزەنشتکردنە.**

**نموونەیەکی دیکە:**

**خالیدی کوڕی وەلید هەندێ حەڵك دەکوژێ بە ناهەق، بە هۆی ئیجتیهادێکی هەڵەی خۆیەوە، پێغەمبەری خواش ρ ناچێ لێی بێدەنگ بێ، بەڵکو دەفەرموێ: {اللَّهُمَّ إِنِّي أَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ خَالِدٌ}[٢٤]، خوایە! من بەرییم لەوەی خالید کردوویەتی، لاشی نابات، بۆچی؟ چونکە دەزانێ ئیجتیهادێکی هەڵەی کردووە، لە قسەی خەڵکەکە تێنەگەیشتوە، ئەوان گوتوویانە: (صبأنا) واتە:**

---

٢٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِي برقم: ٤٠٢١.

٢٤) أَخْرَجَهُ البُخَارِي برقم: ٤٠٨٤، وَقَالَ ابْنُ عُمَر رَفَعَ النَّبي صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلم يَديه وقال: {اللهم إني أبرأ إليك مما صنع خالد}.

**ئێمە مسوڵمان بووین، کەچی ئەو وایزانیوە کە ئەوان دەڵێن: هەڵگەڕاوینەوە!**

**دە: هاندانو مەدح کردن، وەك پێغەمبەری خوا ρ فەرموویەتی:** {نِعْـمَ الرَّجُـلُ عَبْـدُ الله لَـوْ كَـانَ يُصَـلِّي بِاللَّيْـلِ}[٢٥]، **واتـە: عەبدوڵلا باشترین پیاوە ئەگەر شەونوێژان بکات (گوتراوە: لەوکاتە بە دواوە شەونوێژی واز لێ نەهێنان).**

**یازدە: شتێکی بەرجەستەو، نموونەیەکی زیندوو پێشانی خەڵك دان، لەوبارەوە تەماشای ئەم فەرمایشتە بکەن، زۆر جێی سەرنجە:**

{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ρ مَرَّ بِالسُّوقِ دَاخِلاً مِنْ بَعْضِ الْعَالِيَةِ، وَالنَّاسُ كَنَفَتَهُ فَمَرَّ بِجَدْيٍ أَسَكَّ مَيِّتٍ، فَتَنَاوَلَهُ فَأَخَذَ بِأُذُنِهِ، ثُمَّ قَالَ: «أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنَّ هَذَا لَهُ بِدِرْهَمٍ»؟ فَقَالُوا: مَا نُحِبُّ أَنَّهُ لَنَا بِشَيْءٍ، وَمَا نَصْنَعُ بِهِ! قَالَ: «أَتُحِبُّونَ أَنَّهُ لَكُمْ»؟ قَالُوا: وَاللَّهِ لَوْ كَانَ حَيًّا كَانَ عَيْبًا فِيهِ، لأَنَّهُ أَسَكُّ،

---

٢٥) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: ٦٣٣٠، وَالبُخَارِيُّ برقم: ١١٠٥، وَمُسْلِمُ برقم: ٢٤٧٩.

فَكَيْفَ وَهُوَ مَيِّتٌ، فَقَالَ: «فَوَاللَّهِ لَلدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَـى اللَّهِ مِنْ هَذَا عَلَيْكُمْ»}[٢٦].

**واتـه: جـابیرِی كـوڕی عەبـدوڵلا خـوا لـه خـۆیو بـابی ڕازی بـێ، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خـوا ρ بـه بـازاڕدا ڕۆیـی، لـه ناوچـەی عالییـەوە، خـەڵكیش بـه دەوریـەوە بـوون، بـەلای كاریلەیـەكی گوێبڕاو، یان (گوێ زۆر بچووك)دا، تێپـەڕی، كـه كاریلەكـه مـردار بووبوویەوە، گوێی كاریلەكەی گـرت، فـەرمووی: كامـەتان ئەمـەی بە درەمێك دەوێ؟ گوتیان: بە هیچ نامانەوێ، هیچ ئیشمان پێـی نیە، فەرمووی: حەز دەكەن ئەوە بۆ ئێوە بێ، گوتیان: سوێند بە خـوا، ئەگـەر زیندووشـبایە، لەبـەر ئـەوەی گـوێی بـڕاوە، هـەر بەكـەڵك نـەدەهات، ئێسـتا بـە مردوویـی هـەر بـە كـەڵكی هـیچ نایەت! فەرمووی: سوێند بە خوا دنیا لە لای خـوا، لەمـە كـەمترە لە چاوی ئێوەدا.**

---

٢٦) أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: ٢٩٥٧.

واتـه: ئێـوه چـهند ئـهوەتان لـهلا كهمـه، دنیـا لـهلای خـوا لـهوه كهمتره، چاك حاڵی كردوون دنیـا لـهڕووه مادديیهكهیـهوه لـهلای خوا چۆنه، كهواته: به هۆی دنیاوه فریو مهخۆن.

دوازده: به كـردەوه ئـهم شـێوازه لـه هـهموویان گـرنگتره، كـه بـه كـردەوەو ڕەفتـار، شـت پێشـانی خـهڵك بـدرێ، باشـترین شـێوازه، دەتەوێ خـهڵك لـه تـۆوه فێـری نوێـژ بـێ، وەره نوێژكـهری چـاك بكـه، دەتـهوێ فێـری ڕۆژووگـرتن بـێ، ڕۆژووگرێكـی چـاك بـه، دەتەوێ فێری ڕەوشـتی جـوان بـێ، ڕەوشـتت جـوان بـێ، دەتـهوێ فێری دنیا بـه كـهمگرتن بـێ، دنیـا بهكهمگربـه، دەتـهوێ خـهڵك فێری ئازایهتیی بـێ، ئازابـه، دەتـهوێ فێـری ئینصـافو ویـژدانو دادگهریی بێ، دادگهرو به ئینصافو به ویـژدان بـه، دەتـهوێ بـه ڕەحمو بهزەیی بێ، خۆت بهڕەحمو بهزەیی به، ... هتد.

بـهڵێ، لـه ڕاسـتییدا زمـانی كـردار زمـانێكی زۆر فهصـیحو گۆیـاو ڕەوانه، ههموو كهس لێی حـاڵی دەبـێ، بـهڵام مـهرج نیـه هـهموو كهس له زمانی گوفتارو قسه تێبگات، بهڵام زمانی كردار، هـهموو

**کەس لێی حاڵی دەبێ، بە خوا پێغەمبەری ئێمە ρ بە زۆریی بە زمانی کردار خەڵکی حاڵی کردوە، لە ئایینو بەرنامەی خوای پەروەردگار.**

## ٣- ئامرازەکانی بانگەواز:

**بەڕێزان!**

**ئامرازەکانو شێوازەکان، لە کاتێکەوە بۆ کاتێكو، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێكو، لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك دەگۆڕێن، ئایا پێغەمبەری خوا، شێوازو ئامرازەکانی لە مەککە جیا نەبوون، لە هی مەدینە؟ هەروەها ئایا شێوازێك کە لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵانی نزیکیدا بەکاری هێناوە، جیا نەبووە لەهی ئەوانی دیکە؟ بەڵێ، بە تەئکید، بۆ وێنە: بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری فەرمووە: پیاوێکی باشە ئەگەر شەونوێژان بکات، وەك پێشتر فەرموودەکەمان هێنا.**

بەڵام لە فەرمایشتی ڕاست (صحیح)دا هاتوە، دەشتەکییەك دێتە لای دەڵێ: ئایا خوا چی لەسەرمان پێویست کردوە؟ فەرمووی: پاشان باسی زەکات و ڕۆژوو و حەجی کرد، گوتی: سوێندم بەوەی تۆی بە هەق ناردوە نە لێی کەم دەکەم، نە لێی زیاد دەکەم؟ پێغەمبەری خوا ρ فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکات سەرفرازەو دەچێتە بەهەشت، نەیفەرموو: نوێژی سوننەتو ڕۆژووی سوننەت ... هتد.

بە نسبەت ئامڕازەکانەوە هەر زۆر دەگۆڕێن: نووسین، وتاردان، نواندن (تمثیل) {کە کاتی خۆی نەبووە، بەڵام ئێستا زۆرەو، زۆریش کاریگەرە} ، هۆنراوە، سروود، ڕادیۆ، تیڤی، ئینتەرنێت فەیسبووك کە لە ساڵی (٢٠٠٤ز)دا دەست بەکاربووەو، یوتیوب کە لە ساڵی (٢٠٠٥ز)داو، تویتەر کە لە ساڵی (٢٠٠٦ز)دا وەگەڕ کەوتوە، سینەما، شانۆ، گۆڤارو ڕۆژنامە، کۆڕو سیمینار، گەشتو گەڕان، بەشداریی کردن لە بۆنەکانی خەڵك، ئەمانە هەموویان

ئامرازن، کە ئامرازەکان، هەموویان دەچنەوە نێو شێوازەکانو،

شێوازەکانیش هەموویان دەچنەوە نێو ڕێبازی بانگەواز.

## تەوەری شەشەم

# چەسپاویی ڕێبازو، ئامانجی بانگەواز، داهێنانو تازەگەریی و بەردەوام لە شێوازو ئامرازەکانیدا

براو خوشکەکانم!

گـۆڕانو پەرەسـەندن لـە ژیـانی بەشـەردا، لـە دەرەوەی ژیـانی بەشـەردا، لـە دەوروبەرمانـدا، لـە گەردوونـدا، شـتێکی بینـراوو بەرهەستە، جاری دیکەش باسمان کـردوە، زانایـانی گـەردووناس ئێستا نوێترین بیردۆزە کە پێی گەیشتوون دەڵێن: ئەم گەردوونـە هـەمووی لـە تـاکی گەردوونییـەوە هـاتوە، بـە ئینگلیزیـی: سینگلارتی (Singularity) پێ دەڵێن، واتە: تـاکی گـەردوونیی، بـە عـەرەبیی تـۆوی گـەردوون (بـذرة الكـون)ی بـۆ بـەکاردێنن، هـەروەها وشـەی: هێلکـەی گـەردوون (بيضـة الكـون)یشـی بـۆ بەکاردێنن، کە پسپۆڕان دەڵێن: شـتێکی ئەوەنـدە بچووك بـووە، هەرچی ئەندازەی فیزیایی هەیە لەوێدا هەمووی دەوەستێ، چ لە ڕووی گـەرمیی، چ لـە ڕووی کـات، چ لـە ڕووی قـەبارەوە، لـە

**بچــووکییدا شــتی لــەوە بچــووکتر تەصــەووڕ نــاکرێ، زۆر لــە ئەلیکترۆنیش بچووکترە، کـە ئـەلیکترۆن خـۆی زۆر زۆر بچووکە، گەردیلە کە بە میکرۆسکۆبی ئـەلیکترۆنیش نـابینرێ، کـە پێـنج شـەش سـەد جـار زیـاتر شـت گـەورە دەکـات، گەردیلـە (Atum) هەمووی نابینرێ، ئەلیکترۆن لە نێو گەردیلەدا زۆر زۆر بچووکە، ئنجا ئەو سینگۆلارتییە لە ئـەلیکترۆنیش زۆر بچووکترە، دەڵێن: ئـەم گەردوونـەی ئێمـە هـەموو لـەوەوە هـاتوە، کـە ئـەم ئایەتـە ئاماژەی پـێ دەکـات، خـوای بـەرزو مـەزن دەفـەرموێ:** ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾الأنبياء.

**واتــە: ئایــا ئەوانــەی بێــبڕوان نەیانــدیوە (بــە چــاوی عــەقڵ‌و نــەیانزانیوە) کــە ئاسمانــەکان‌و زەوی پێکــەوە لکــاو (پێکــەوە چۆشـــــدراو) بـــــوون، لەیـــــەکمان جیاکردنـــــەوەو هـــــەموو ژیانداریێکیشمان لە ئاوێ دروست کردوە.**

یانی: ئەم گەردوونـە لـە سـینگۆلاریتییەكەوە هـاتووەو، بۆتـە ئـەم هەموو ملیاران كەهكەشانە، كە هەندێ لە زانایان دەڵێن: ژمارەی كەهكەشانەكان بە دووسەد ملیارو، هەنـدێكی دیكـە دەڵـێن: یـەك تریلیـــۆن (هـــەزار ملیـــار) كەهكەشـــان مەزەنـــدە دەكـــرێن، كەهكەشانەكەی ئێمە، ئەستێرەكانی چوون نێو خۆی، كە خـۆری ئێمـە یەكێكـە لـە ئەسـتێرەكانی، بـە یـەك تریلیـۆن ئەسـتێرە مەزەندە دەكرێن، دەڵێن: هەمووی لەو شتە بچووكەوە هاتوە، كـە وەك من لە مەوسـووعەی: (ئیمـانو ئیلحـاد)دا باسـم كـردوە، كـە ئەوانە هەر نایانەوێ دانی پێدا بێنن، ئەگەرنا ئەوە هەر نەبوون (عـدم)ەو، خـوا گـەردوونی لـە نەبوونـەوە هێناوەتـە بـوون، ئنجا ئەم گەردوونە هەمووی لە گۆڕاندایـە، دەورو بـەر لـە گۆڕاندایـە، بۆیـــە ژیـــانی مرۆڤـــ لـــە گۆڕاندایـــە، ئەگـــەر بێـــتو چـــاو بـــە ئامرازەكـــانی كـــارو شـــێوازەكانماندا، نەگێڕینـــەوە، لـــە بـــواری بانگـەوازو، لـە هـەر بـوارێكی دیكـەداو، ئاگامـان لێیـان نـەبێ، لـە ڕۆژگـاری خۆمانـدا بەجێـدەمێنینو، كارەكـەمان پـڕ بـە پێسـتی

واقیعەکەمان نابێ، بۆیەش بۆ ناوونیشانی بابەتەکەم: دوو وشەم بەکارهێناون: {بەرەو بانگەوازێکی ڕاستو ڕەسەن}، ڕاست ئەوەیە پڕ بە پێستی واقیع بێ، بە شێوازی تازە بانگەواز بکەی، ڕەسەنیش ئەوەیە کە پابەند بێ بە شەریعەتەوە، چونکە ئەگەر لە شیرازەی شەریعەت چووە دەر، ڕەسەنایەتیی لە دەست دەداو، خاوەنەکەی لەسەری قەرزار دەبێتەوە.

ئەگەر تەماشای پێغەمبەری خاتەم ﷺ بکەین، پاشان خەلیفە ڕاشیدەکانیو، دوای ئەوان زانایانو پێشەوایانی ئێمە، هەر کامێکیان بارودۆخو هەلو مەرجو ژینگەی خۆی باش خوێندۆتەوەو هەوڵیداوە باشترین شێوازو ئامراز کە لە سەردەمی ئەودا هەیەو، کاریگەرترین شێوازو ئامراز بەکار بهێنێ، بۆ وێنە:

١- پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ نامە بنووسێ بۆ هیرەقل پادشای ڕۆمو، کیسرا پادشای فارس، یەکێ لە هاوەڵان خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ پادشاکان عادەتیان وایە، نامە

ئەگەر مۆر نەكرێ، نایخوێننەوە، ئەویش نافەرموێ: من چۆن تەقلیدی كافران بكەم؟! وەك هەندێ خەڵكی فیكر وشكو لە ڕۆژگاری خۆیان بەجێماو، بەڵكو دەفەرموێ: مۆرێكم بۆ دروست بكەن[٢٧]، چونكە پێغەمبەر ﷺ دەبێ ڕەچاوی ئەو عورفو باوە بكات كە تێیدا دەژی، ناكرێ ڕەچاوی عورفو باوەكە نەكاتو، نامەكەی بچێو نەخوێنرێتەوە، چونكە مۆری پێوە نیە!!

٢- هەروەها لە بواری تەكنیكی جەنگییدا سەلمانی فارسی كە باسی خەندەق بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەكات، پێغەمبەری خوا پێشنیارەكەی تەبەننیی دەكاتو خەندەك لێدەدەن[٢٨]، لە بواری بەكارهێنانی ئامرازەكانی جەنگدا، مەنجەنیقو دەبابە بۆ یەكەمین جار لە دوورگەی عەرەبیی دا لەلایەن سوپای پێغەمبەرەوە ﷺ بەكارهاتوو[٢٩].

---

٢٧) (فتح الباري شرح صحيح البخاري: ج٦، ص١٩٨، وأيضا (مآثر الإنافة في معالم الخلافة) للقلقشندي ص١١٧، ١١٨.
٢٨) السيرة النبوية لإبن هشام، ج٣، ص٢٧٤.
٢٩) السيرة النبوية لإبن هشام، ج٤، ص٢٧٤.

٣- ئنجا دوای خۆیشی خەلیفە ڕاشیدەکانی بە هەمان شێوە، بۆ وێنە: عومەر خوا لێی ڕازی بێ، ئەو عەبقەرییە، کە ئەو وشەیە هەر وشەی پێغەمبەرە ﷺ، کە دەفەرموێ: {فلَمْ أَرَ عَبْقَرِيّاً مِنَ النَّاسِ يَنْزِعُ نَزْعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ}[٣٠].

واتە: هیچ عەبقەرییەکم نەدیوە وەکو عومەری کوڕی خەتتاب ئاو لە بیرێ دەربێنێ.

ئەو پیاوە بلیمەتە کە توانی هەرچی ڕۆشنبیریی‌و ئەزموونی حوکمڕانیی ڕۆم‌و فارس هەیە، بیهێنێ بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی، سوودی لێ ببینێ، بەو عەقڵە گەورەو ئازادەی، کە هیچ هەستیاریی نەبوو بەرانبەر بە شێوازو ئامڕازو سەرجەم ئەو داهێنانەی نامسوڵمانان کە عەقڵی بەشەر پێیان گەیشتوە.

چونکە جاری دیکەش باسمان کردوە: ئێمە دوو بوارمان هەن: بواری پەرستشەکان (عبادات)و مامەڵەکان (معاملات)، پەرستشەکان زۆر لە زانایان زیاتر بۆ دروشمەکان (شعائر)

---

٣٠) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: ٦٦١٨.

**بەکاری دێنن، بەڵام من پێم وایە پـێش دروشمـەکان بووننـاسـیی، ئیمانو عەقیدە، ئنجا دروشمەکان، ئەوە هەمووی پێی دەگـوترێ: پەرستشەکان (العبادات)، واتە: مامەڵە کردن لەگەڵ خوادا، کە بۆ مامەڵـە کـردن لەگـەڵ خـوادا، دەبـێ پایەنـد بـین بـە دەقـەککانی شەریعەتەوە، وەك گوتراوە:** (الأصـل فـي العبـادات الحظـر، أو المنـع، إلاَّ مـا دلَّ الشـارع علـى شـرعيَّته)**، واتـە: بناغـە لـە پەرستشـەکاندا قەدەغـە بـوونو ڕێ لێگیرانـە، جگـە لـەوەی شەرعدانەر دایناوە.**

**مەگـەر ئـەوەی خـوا فـەرمووبێتی: ئـاوا خـوا پەرسـتیی بکـەن، لـەڕووی ئیمـانو عەقیـدەوەو، لـەڕووی دروشمەکانـەوە، ئەگـەرنا لەخۆتـەوە بـۆت نیـە، شـتێك دابنێـی، بـەڵام مامەڵـەو هـەڵسو کەوتـەکان بـە پێچـەوانەوەن:** {الأصـل فـي المعـاملات أو العادات الإباحة، إلاَّ ما دلَّ الشارع على تحريمـه}[31]**، مەگەر**

---

٣١) (القواعـد النورانيـة الفقهيـة) لإبـن تيميـة، ص١١٢، ص١٨٨. و(منظومة القواعد الفقهية) للسعدي، ص١٠٥ و ١٠٦.

شــاريع قەدەغــەی کردبــێ، ئەگــەرنا ئەصــڵ تێیــدا ڕەوایــیو دەستكراوەییە.

لـە بـواری هـەڵسو كەوتەكانـدا دوو مـەرج هـەن، چ بـۆ ئـامڕازو شێوازەكانی بانگەواز، چ بۆ غەیری ئەوانە، دوو مەرج هەن:

یەكەم:

ئەو شێوازو ئامڕازە لە خودی خۆیدا قەدەغە نەبێ.

دووەم:

بەرژەوەندیی بێنێتە دی.

ئەوەتان بۆیە ئاوا بـۆ شـی دەكەمـەوە چـونكە: ئێسـتا یـەكێك لـە هۆكارە كاریگەرەكانی كە لـە ڕاگەیاندنەكانـدا هەیـە، بریتیـە لـە: مەسەلەی نواندن (تمثـل)و شانۆ، فیلم، ئێستا ئەو بەسەرهاتانەی كـە لـە تیڤییەكانـدا بـە چـەندان ئاڵقـە پـەخش دەكـرێن، زۆر كاریگــەرن، زۆر خێــزان هــەن بۆیــان دادەنیشــن، بــۆ وێنــە: بەســەرهاتەكەی یوســف (علیــه السـلام)، كـە مـەرج نیـە تێبـینی

لەسەر نەبێ، یان بەسەرهاتی عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، کە لەزۆر کەناڵەکاندا پێشاندرا.

هەروەها بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف) تۆ کە کتێب دەخوێنیەوە، بە شێوەیەکی نەزەری وەریدەگری، بەڵام کە بە فیلم تەماشای دەکەی، بە شێوەیەکی بەرجەستە کراویی زۆر کاریگەریی زیاتری لەسەرت دەبێ‌و، باشتر لێی تێدەگەی، ڕەنگە ئێوە لە من زیاتر موتابەعەتان کردبن، من ئەو دەرفەتەم نیە، بەڵام خۆتان دەزانن کە هۆکارێکی زۆر کاریگەرە، ئنجا وەك من لە کتێبی: (چەند بابەتێکی هونەریی)دا، باسك کردوەو ئیسپاتم کردوە، کە سەرجەم ئەو ئامڕازانە ئەوانەی کە بۆ ڕەواج پێدانی ئیسلامو، تیگەیاندنی خەڵكو، ئیقناع کردنی خەڵكو بەرچاو ڕوون کردنەوەیان بەرانبەر بە ڕاستیەکانی ئیسلام، بەکاردەهێنرێن، مادام بۆ هێنانەدی ئامانجە شەرعیی‌و ڕەوایەکان بەکاربهێنرێن، شتی پەسندو باشن، چونکە:

بنچـینەیەکی شـەرعییە، (لِلوَسَـائِلِ حُکْـم المَقَـاصِـد) ئامرازەکـان حوکمی ئامانجەکانیان هەیە.

ئنجـا دەبـێ تەماشـا بکـەین: ئایـا بـەو ئامرازانـە خـەڵك پێغەمبەرانو هاوەڵانو پیاوچاکانی لەلا خۆشەویست دەبن، یان لەبەر چاوی دەکەون؟! بە تەئکید لەبەر چاوی خۆشەویست دەبنو، زیاتر تێیاندەگاتو پێیان ئاشنا دەبێ.

بەڵێ هەمیشە ڕێبازو ئامانجی بانگەواز چەسپاونو، نەگۆڕن، بەڵام شێوازەکانو ئامرازەکان، دەبێ بەردەوام چاویان بەسەردا بگێڕینەوە، ئێستا تەماشا بکەن:

کاتی خۆی کتێب باشترین هۆکار بوو، بۆ ئەوە خەڵك هۆشیار بێتەوە، بەڵام ئێستا سۆشیال میدیا، یان ڕاگەیاندنی ئەلیکترۆنیی، چەند بەخێرایی شت دەگەیەنێو بڵاوی دەکاتەوە! هەڵبەتە کتێب کاریگەریی خۆی هەر هەیە، بەڵام سۆشیال میدیاش زۆر کاریگەرە، ئنجا تۆ چۆن دەبێ بەرهەمی خۆت بێ بەش بکەی لەو هۆکارە کاریگەرە، کاتی خۆ لە وڵاتی حیجاز

هەنــدێ فــەتوای وشــك دراون، كــە لــە ڕاســتییدا بەرهــەمی دواكــەووتوێتیی عەقڵــەكان بــوون، نــەك هــی چــەمكو واتــای دەقەكان، بۆیە ئێستا فەقیرانە وردە وردە پێیدا دەچنەوە! ئێمە زۆر پــێش ئێســتا دەمــانگوت: مــەعقوولْ نیــە لەســەردەی پێغەمبــەردا ﷺ ئـافرەت حوشـتری لـێ خوڕیـوە، ئێسـتا تـۆ بـە پۆشتەو پەرداخیی بڵێی: قەدەغەیە سەیارەی لێ بخوڕێ! هەنـدێ شتی دیكەش هەیە من پـێم وایـە لـە داهـاتوودا چاو بەوانەشـدا دەگێڕنـەوە، بـۆ وێنـە: دەڵێن: خـەڵك نـابێ خۆپێشـاندان بكـات، نـابێ مـانبگرێ، نـابێ ڕەخنـە بگـرێ، ئـەی چـی بكـات؟ تـۆ وا سـەرقاپ لەسـەر خـەڵكی دابخـەی، ئـەدی نـازانی دوایـی لـە ژێـر فشاری زۆردا دەتەقێتەوە؟!

بـە هـەرحاڵ ئێمـە دەبـێ بـەردەوام تەماشـای ڕۆژگـاری خۆمـان بكـەینو، تەماشـا بكـەین: بـۆ ڕۆژگـاری ئێمـە، چ شـێوازێكو چ ئامڕازێك كاریگـەرترەو، سوودی باشـتر دەگەیـەنێ، باشـتر خـەڵك پێـی كـارتێكراو دەبـێ، دەبـێ ئــەوە بــەكاربێنین، ئەگـەرنا لــە

ڕۆژگـاری خۆمـان بـەجێ دەمێـنین، زۆریـش پەرۆشـی ئیسـلامەمە کاتێــك کەســـانێك نوێنەرایـــەتیی دەکـــەن بـــە عـــەقڵێکی دواکەوتووانە، وەك تاڵیبان لە ئەفغانستان کاتی خـۆی دەیـانگوت: ئـافرەت نـابێ بخـوێنێ، نـابێ لـە هـیچ کایەیـەکی کۆمەڵایـەتیی و سیاسـییدا دیـار بـێ، هـەروەها زۆر شـتی دیکـەش، ئنجـا کاتێـك ئیســلام کەســانێکی دواکــەوتوو بــە شــێوەیەکی بەجێماوانــەو دواکەوتووانــە پێشـانی دەدەن و بەرجەسـتەی دەکـەن، بێگومـان چەندان کەس بـە هـۆی ئـەو هـەڵس و کەوتانـە تاڵیبـان و غـەیری تاڵیبان وەك داعش و بۆکۆحەڕام و هاووێنەکانیان لە ئیسلام دوور دەکەوێتەوە.

کە بـە دڵنیـایی ئـەوان (دیـن) و (ژین)یـان بـاش نەخوێندۆتـەوە، نەك دەقەکانی قورئان و سـوننەت ئـەوە بگەیـەنن، چـونکە ئێمـە کاتێ دەگەڕێینەوە بۆ وەحیی، ڕێ ئاسان و ئاچووغە، بەڵام کاتێك دەچـین بـۆ ڕای کـرچ و کـاڵی بەشـەر، کارەکـەمان لـێ بەزەحمـەت دەکەوێ، جای دیکەش ئەم نموونەیەم هێناوەتەوە:

مەسەلەی تەیەمموم، وەك لە تەفسیری ئایەتی (٦)ی سوورەتی (المائدة)دا بە تەفصیلێ باسم کردوە[٣٢]، خوای پەروەردگار دەفەرمویێ: ﴿فَلَم تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا ۝٦﴾، واتە: ئەگەر بۆ دەستنوێژو غوسل ئاوتان چنگ نەکەوت، ڕوو بکەنە ڕووی پاکی زەوی، (صعيد) یانی: ڕووی زەوی، (طيب) یانی: پاك، کەواتە: ڕووی پاکی زەوی هەمووی تەیەمموومی پێدەکرێ، بەلاّم بۆ وێنە: لە مەزهەبی ئیمام شافیعییدا دەڵێ: {ولا يجوز التيمم إلا بتراب طاهر له غبار} واتە: تەیەمموم دروست نیە، مەگەر بە گڵێك تۆزی لێ هەڵسێ.

وشەی (صعيد) لە فەرهەنگەکانی زمان دەڵێن: ڕووی زەوی[٣٣]، ڕووی زەوی، جاری وا هەیە بەبەفر دادەپۆشرێ، جاری وا هەیە بە گژو گیا داپۆشراوە، جاری وا هەیە بە چەوو لمو بەرد داپۆشراوە، جاری وا هەیە بەقوڕ داپۆشراوە، ڕووی زەوی،

---

٣٢) لە تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێزدا بڕوان بەرگی چوارەم.

٣٣) مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص٢٩٨ (والصعيد: يقال لوحة الأرض).

ئایەتەکە هەمووی دەگرێتەوە، بە پێی ئایەتەکە قەت عاسێ نابین، بۆ خۆم جاری وا بووە چەند شەوو ڕۆژان لە نێو بەفرێدابوومە، ئایا گڵ لە کوێ بێنین کە تۆزی لێ هەڵسێ؟ دەبێ سێ چوار مەتر بیکۆڵی، ئنجا دەبێتە قوڕو دیسان گڵی تۆزت دەست ناکەوێ! ئیمام شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دیارە لە شوێنێك بووە گڵی زۆری لێ بووە، بەڵام شوێنی وا هەیە لەم دنیا فراوانەی خوادا لە ئەسکیمۆو بەستەڵەکەکانو، لە زۆر شوێنی دنیا بەس بەفرو سەۆڵبەندان، هەروەها شوێنی وا هەیە تەنیا لمی لێیەو، گڵی هەر لێ نیە، دیسان بەهاران دەشتو کێو هەر سەوزە گیای لێیە! ئنجا ئینسان کە دەگەڕێتەوە بۆ وەحیی، ڕێیەکە زۆر فراوانە، بەڵام کە دێی بۆ مەزهەبو ڕاو بۆچوون ڕێگاکە زۆر تەسك دەبێتەوە، ئنجا هەر لەووە با ئینسان قیاسی بکات، ئەگەرنا هەرگیز شەریعەت مسوڵمانان سەغڵەتو ناچار ناکات کە لە عەسرو زەمانی خۆیان دوا بکەون، خەڵکی دیکە نوێترینو باشترین ئامڕازو هۆکار بەکاربێنێ بۆ کارەکانی خۆیان،

بـەڵام مسوڵمان هـەر شـێوازو ئـامڕازە کۆنـەکان بـەکاربێنن، کـە بێگومان شێوازو ئامڕازەکان موقەددەس نین؟!

ئنجا خوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٤ ﴾إبـراهيم، واتـە: هـيچ پێغەمبەرێکمان نـەناردووە مەگـەر بـە زمـانی خەڵکەکـەی خـۆی تاکو بۆیان ڕوون بکاتەوە کەواتە: چۆن چۆنی باشـتر بـۆ خـەڵك ڕوون دەبێتـەوە، دەبـێ ئـەو ئـامڕازو شـێوازە بـەکاربێنیو، چـۆن چاکتر تێدەگـەن، دەبـێ پـەنا بەریـە بـەر ئـەو شـێوازو ئـامڕازە، چونکە ئامانج تێگەیاندنی خەڵکە، کە پەیامی خوایان پێ بگاتو لـە خـوا نزیـك ببنـەوە، لـە دیـنی خـوا حـاڵی بـبن، کـە ئـەوە چەسپاوەو نەگۆڕە، بەڵام شێوازو ئامڕازەکە دەبـێ تەماشا بکـەی، کامەی کاریگەرترە، دەبێ ئەوە بەکاربێنی.

ئەو قسەیەی عەلی كوڕی ئەبی تاڵیبیش زۆر جوانە كە دەڵێ: {حَـــدِّثُوا النَّــــاسَ بِمَــــا يَعْرِفُـــونَ أَتُحِبُّـــونَ أَنْ يُكَــــذَّبَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ}[٣٤]، واتە: باسی شتێك بۆ خەڵك بكەن كە پێی ئاشنا بن، ئایا حەز دەكەن خواو پێغەمبەرەكەی بە درۆ دابنرێن؟ واتە: بە شێوەیەك باسی ئیسلامیان بۆ مەكەن كە خەڵك لێی بكەوێتە گومان‌و، بە پێی ئاستی خەڵك، خەڵك بدوێنن.

ئنجا لە ڕاستییدا ڕەسەنایەتی‌و (أصالة)ی بانگەوازی ئیسلامیی، بەرهەمی پابەندیەتی بەو ئامانج‌و ڕێبازەوە كە باسمان كردن، ڕاستییەكەشی زادەی واقیعی بوون‌و هاوچەرخ بوونی شێوازو ئامرازەكانیەتی، ئەوەش خولاصەی قسەكەیە.

بە واتایەكی دی: ڕەسەنایەتیی بانگەوازی ئیسلامیی، پەیوەستە بە نێوەڕۆك‌و جەوهەرەكەیەوە، كە ئایین‌و بەرنامەی خوایەو، ڕاستیی‌و دروستییەكەشی پەیوەستە بە چۆنیەتی گەیاندنیەوە، ئەویش ئەوەیە، پڕ بە پێستی واقیع‌و سەردەم بێ‌و، بە گوێرەی

---

٣٤) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: ١٢٧.

زمانو عەقڵی جەماوەر بێو، بە تازەترینو کاریگەرترین شێوازو

ئامڕاز بێ.

## تەوەری حەوتەم

## بنەما گرنگەكانی بانگەواز ( الأصول المهمة للدعوة )

بەڕێزان!

دەگونجێ زۆر شت وەك بنەماو، پایەی گرنگی بانگەواز بخەینە ڕوو، بەڵام ئێمە دە (١٠) دانەمان هێناون، لەو بنەما گرنگانەی كە پێویستە لە بانگەواز كردندا، بۆ لای خوا Iو ئایینو، بەرنامەی خوا، ڕەچاو بكرێن:

١- نیازو مەبەستی ساغ (الإخلاص)

٢- شارەزایی بە ئایینو، ئاشنایی بە ژین

٣- سێ كوچكەی: هەبوونی نەخشەو بەرنامە + كاری دامەزراوەیی + ڕاوێژكردن

٤- ڕەچاو كردنی: پلە پلەییو، دیاریكردنی لە پێشترەكان (مراعاة التدرّج وتحديد الأولويات)

٥- دڵخۆشكردنو ئاسانكردن (التبشير والتيسير)

٦- ئیقناع كردنی عەقڵو جووڵاندنی دڵ

٧- بیرخستنەوەی چاكەكانی خوا (التذكير بنِعَمِ الله)

٨- هۆشداریی پێدانو ترساندن

٩- جەخت كردنەوە لەسەر واقیعی ئێستای خەڵكو، پێویستیی خەڵك لە ئێستادا

١٠- جەستاندنی پەیامو بەرنامەی خواو، بوونە سەر مەشق بۆ خەڵك.

یەكەم: نیازو مەبەستی ساغ (الإخلاص):

براو خوشكە خۆشەویستەكانم!

گرنگترینو یەكەمین پایەو بنەما، بۆ ئەنجام دانی بانگەوازێكی ئیسلامیی ڕاستو ڕەسەن، بریتیە لە نیازو مەبەستی ساغ (الإخْلاَص)، وشەی (إخلاص)یش لەسەر كێشی (إفْعَال)ە، (أَخْلَصَ يُخْلِصُ إخْلاَصَاً) واتە: دەربازی كرد، دەربازی دەكات، دەربازكردن، واتە: كردەوەكانی خۆت دەربازكەی لەوە كە بەشی

غـيری خۆيـان پێـوەبێ، خاڵيصـيان بكەيـەوە، سـاغيان بكەيـەوە، بەشی غەيری خۆيان پێوە نەهێڵێ.

ئێمە كە كتێبە فيقهييەكان دەخوێنين، مەگەر چۆن دەنا هـەموو كتێبێكی فيقهيی بە: (كِتـَاب الطَّهَـارة) (باسـی پـاكو خـاوێنيی) دەست پێدەكات، چونكە بۆ هەموو پەرستشەكان, دەبێ جەستەت خـاوێنبێ, پۆشـاكت خـاوێنبێ، شـوێنت خـاوێن بـێ، ئـەوجار وەبەردەكەون، ئنجا بۆ كردەوەكانيش بە هەمان شێوە, دەبـێ دڵ دەروونت خاوێن بێ، ئنجا خوای پـەروەردگار لێتـان وەردەگـرێو، قبووڵيان دەكات، با تەماشای چەند دەقێكی شەريعەت بكەين:

١)- خوای پەروەردگار لـە سـوورەتی (البينـة)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ٥ ﴾.

واتــه: (خــەڵك) فــەرمانیان پــێ نــەكرا بــوو، مەگــەر بــەوە كــە بەندایەتی بۆ خوا بكەن، ملكەچی خۆیان بۆ خوا ساغ بكەنــەوە، بە پاكیی‌و نوێژ بــەرپا بكــەن‌و زەكات بــدەن، ئــا ئــەوەش ئــایینی كۆمەڵێكی ڕێك‌و ڕاستە.

وشەی (دین) لە ڕستەی: ﴿مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾دا، بە مانــای ئیسلام نیە، بەڵكو لێرەدا (دین) بە مانــای ملكەچیی دێ، یــانی: تاعــەتی خۆیــان بــۆ خــوا ســاغ بكەنــەوە، واتــە: وەك بــۆ خــوا ملكــەچ‌و گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەرن، ئەو جۆرە فەرمانبــەریی‌و گوێڕایەڵییــە، بۆ كەسی دیكە نەكەن.

(حُنَفَآءَ) كــۆی (حنیــف)ە، واتــە: كەســێك وازی لــە بــەتاڵ پــووچ هێنابێ‌و, بەرەو هەق گەڕابێتەوە[٣٥].

---

٣٥) مفردات ألفاظ القرآن، ص١٤٩، المطبعة العصرية، ٢٠١٢م.

﴿ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، نوێــژ بــەرپا بكــەنو زەكــات بدەن، ﴿ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴾، ئا ئەوە ئايينى ئۆممەتێكى ڕێكو ڕاستە.

٢)- لــە ســووڕەتى (الزمــر)دا، خــوا دەفــەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ٢ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُ ٣ ﴾.

واتە: ئێمە كتێبمان بۆ تۆ دابەزاندوە بە هەق, بەندايەتى بۆ خوا بكە, ملكەچى خۆتى ساغ بكەوە، ئاگاداربن! ملكەچيى ساغ تەنيا بۆ خوايە (يان: تەنيا ملكەچيى ساغ بۆ خوايە)، واتە: تاعەتێك كە ساغ نەكرابێتەوەو، خڵتەى ڕياو ڕوودەربايسى پێوەبێ, خوا نايەوێ.

**پێغەمبەریش ﷺ لەم فەرمایشتەدا دەفەرموێ:** {إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى...}[٣٦].

**واتە: بە دڵنیایی کردەوەکان تەنیا بە پێی نیازو مەبەستەکانن‌و، هەر مرۆڤێك بەپێی نیازو مەبەستەکەی نێو دڵی کە هەیبووە، کردەوەکەی بۆ بەردەکەوێ.**

**بەڵام ئایا ئەگەر کەسێك کردەوەیەکی خراپ بکات، بەڵام نیەتی باشی لێ بێنێ، بۆی حیسابە؟ نەخێر، «إِنَّمَا الأَعْمَالُ» وشەی «الأَعْمَال» ئەلیف‌و لام (أل) تەعریفی لەسەرەو مەبەست پێی جینسە، یانی (جنس الأعمال الصالحة)، هەموو ئەو کردەوانەی کە لە شەریعەتدا بە چاك دەزانرێ, نەك هەرکردەوەیە چاك بێ، یان خراپ بێ! یانی: کردەوە چاکەکان بە پێی نیەتن، ئەگەرنا کردەوەی خراپ، هەرخراپەو نیەتیشت**

---

٣٦) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: ٦٥٥٣، وَمُسْلِم برقم: ١٩٠٧.

چاك بێ هیچ نیە، بەڵام كردەوەی چاكیش, ئەگەر نیەتی ساغو چاك نەبێ، وەرناگیرێو قبووڵ ناكرێ.

ئنجا با تەماشا بكەین: ئایا لە ئەنجامی ئیخصلاصو تەنیا خوا پێ مەبەست بوونو، دڵی خۆ بۆ خوا ساغكردنەوەدا، چیمان دەست دەكەوێ؟ سێ بەرهەمی گرنگو مەزنمان دەستگیر دەبن:

١)- بەرەكەت دەكەوێتە كارمانو، خوا كارەكەمان لێ قبووڵ دەكات. ٢)- خوا ڕێنماییمان دەكاتو سەر ڕاستمان دەكات. ٣)- كارمان ئاسان دەكات، دەرووی خێرمان لێدەكاتەوە، بەم بەڵگانەی خوارێ:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾﴾المائدة،

واتە: خوا تەنیا لە پارێزكاران قبووڵ دەكات.

پارێزكار: كەسێكە پێش هەموو شتێك خۆی لە شیركو ڕیا بپارێزێ، دڵی خۆی ساغو ساف بكات بۆ خواو، دڵەكەی جگە لە

**خوا ڕازیی کردن‌و، غیری خۆ له خوا نزیك كردنه‌وه‌ی تێدا نه‌بێ‌و, هیچ هانده‌رێكی دیكه‌ی نه‌بێ.**

**٢- خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێ:** ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾﴾العنكبوت، **واته: ئه‌وانه‌ی له پێناوی ئێمه‌دا تێده‌كۆشن, ڕێبازه‌كانی خۆمانیان پێشان ده‌ده‌ین‌و, به دڵنیاییه‌وه خوا له‌گه‌ڵ چاكه‌كاراندایه.**

**كه‌واته: له ئه‌نجامی ئه‌وه‌دا كه به ساغیی له پێناوی خوا تێبكۆشی، خوا ڕاسته ڕێت ده‌كات‌و له‌گه‌ڵتدا ده‌بێ‌و، پشتت ده‌گرێ.**

**٣- هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێ:** ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا ﴿٤﴾﴾الطلاق، **واته: هه‌ر كه‌سێك پارێز له خوا بكات، خوا كاری بۆ ئاسان ده‌كات.**

**پارێز لە خوا كردنيش پێش هەموو شتێك بناغەكەی بريتيە لە ساغيی (إخلاص).**

**(إبن عطاء الله الأسكندري) عاريفێكی گەورەيە، كتێبێكی بچووكی هەيە بە ناوی (الحِكَمْ)، كە بە (الحِكَمُ العَطَائِيَة) مەشهوورە، قسەی زۆر نەستەق و جوانی تێدان، يەكێك لە قسەكانی ئەوەيە دەڵێ:**

**(الأَعْمَالُ أَشْبَاحٌ أَرْوَاحُهَا وَجُودُ سِرِّ الإِخْلاَصِ فِيْهَا)، واتە: كردەوەكان وەك تارمايیو كەلەشێك وان، ڕووحی كردەوەكان، بريتيە لە هەبوونی ئيخلاص لەو كردەوانەدا.**

**ئنجا وەك برايەكی دڵسۆزی خۆتان پێتان دەڵێم: بڕوا بكەن، نهێنيی بەرەكەت لە ژيانی مرۆڤدا، ئەوە كە خوا لەگەڵ ئينساندابێو، پشتی بگرێو كاری بۆ ئاسان بكات، ئەوەيە كە ڕووی دڵی بكاتە خوا، ئێمە چۆن دەست بە نوێژ كردن دەكەين؟ يەكێك لە دوعايەكانی دەستپێكردنی نوێژ (أدعية الإستفتاح)،**

ئەوەیــە: {وَجَّهْــتُ وَجْهِــيَ لِلَّــذِي فَطَــرَ السَّــمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًـا وَمَـا أَنَـا مِـنَ الْمُشْـرِكِينَ}[٣٧]، واتــە: بــە پــاكیی‌و ســاغیی ڕووی خۆم (ڕووی دڵی خۆم) كردە ئەو كەسەی كـە ئاسمانـەكان‌و زەوی هێناونەدی‌و، من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم.

(وَجْهِـي) یـانی: ڕووی دڵـی خـۆم، چـونكە تـۆ ڕووی جەسـتەت دەكەیە قیبلـە! بـەڵام كـە دەڵێـی: ڕووی خـۆم، واتـە: ئـەو نوێـژو تاعەتەی كە دەیكەم، تەنیا مەبەستم پێی ئەوەیـە: كـە خـوا لـێم ڕازی بێ.

ئنجا پایەو بنەمای یەكەمی سەروبەرگرتن‌و بەرەكەت تێكـەوتنی كاری بانگەواز، ئەوەیە كـە ئـیخلاص‌و خـوا پـێ مەبەسـت بـوون، هەوێن‌و هەناوو هاندەر بێ.

---

٣٧) أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: ١٥٠٦٤، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٢٧٩٥)، وَابْـنُ مَاجَهْ برقم: ٣١٢١، وَالحَاكِمُ برقم: ١٧١٦، وَقَـالَ: صَـحِيحٌ عَلَـى شَـرْطِ مُسْلِم.

**دوو: شارەزایی بە ئایینو ئاشنایی بە ژین:**

**ئایا ئەگەر ئینسان لە ئایینو بەرنامەی خوا شارەزانەبێ، خەڵکی بۆ کوێ بانگ دەکات؟ با وەك شتێکی خۆش بۆتان بگێڕمەوە، جار جار قسەیەکی خۆشتان بۆ بکەم باشە:**

**دەگێڕنەوە کاتی خۆی مسوڵمانێك تەماع لە ماڵو سامانی جوولەکەیەکی بازرگان دەکات، لە ڕێگادا بۆسەی بۆ دادەنێو، دەڵێ: ڕووتبەوەو کەلو پەلەکان دابنێ! ئەویش دەڵێ: بۆچی؟ مسوڵمانەکە دەڵێ: یان دەبێ ڕووت بی، یان دەبێ مسوڵمان بی!**

**کابرای جوولەکەش دەڵێ: دەی باشە، مەمکوژە کاکە، مسوڵمان دەبم.**

**مسوڵمانەکە دەڵێ: دەی مسوڵمان بە!**

**جوولەکەکە دەڵێ: باشە، چی بڵێم؟**

**مسولمانەكە دەڵێ: وەڵڵا نازانم! یانی: بۆ خۆی نازانێ مسولمانەتیی چییە، تاكو ئەو مسولمان بكات!**

**بە تەئكید، ئینسان دەبێ بۆ خۆی بەرچاوڕوون و شارەزا بێ بە دین، ئنجا دەتوانێ خەڵكی بۆلا بانگ بكات، (**إبن البنا السرقطي**) لە شیعرێكی دا كە (**إبن عجيبة**) شەرحی دەكات، زۆر جوان دەڵێ:**

وَإِنَّمَا القَوْمُ مُسَافِرونَ

لِحَضْرَةِ الحَقِّ وَظاعِنُونَ

فَافْتَقَروا فِيهِ إِلى دَلِيلِ

ذَي بَصَرٍ بالسيَّرِ وَالْمَقِيلِ

قَدْ سَلَكَ الطَّرِيقَ ثُمَّ عَادِ**!**

لِيُخْبرَ القَوْمَ بمَا اسْتَفَادَا

**باسی ئەوانە دەكات كە دەیانەوی لە خوا نزیك ببنەوە، دەڵێ:**

ئەوانــە ڕێبــوارن، بــەرەو لای پــەروەردگاری هــەق دەچــن‌و، لــە هەندێ شوێن دەبێ بارگەو بنە بخەن.

پێویستییان بـە ڕێ پێشاندەرێك هەیـە، كـە شـارەزا بـێ لـە كـوێ بڕۆن‌و لە كوێش قەیلوولە بكەن‌و پشوو بدەن.

چـۆن بـێ دەبـێ ئـەوە؟ ڕێیەكـەی بڕیـوەو گەیشـتۆتە ئەوسـەری، ئنجـا گەڕاوەتـەوە، بـۆ ئـەوەی هـەواڵ بـە خـەڵكی دیكـە بـداتو، خەڵكی لەگەڵ خۆی بەرێ، عادەت وایە: ئەو كەسـەی كـە دەبێتـە دەلیل‌و ڕێ پێشاندەر، دەبێ بۆ خۆی بە هەموو ڕێیەكاندا شارەزا بێت، كەواتە: بەبێ شارەزایی لە دین ئینسان نـاتوانێ بانگـەوازی بۆ بكات.

ئنجا ئاشـنایی بـە ژیـن، مەبەسـتم پێـی ئەوەیـە كـە ئینسـان لـەو كۆمەڵگایــەدا كــە پێیــدا دەژی، دەبــێ بــە خێــرو شــەڕی ئــەو كۆمەڵگایە، بە تەوژمە فیكرییەكانی‌و لایەنە سیاسییەكانی، ئنجا پاشخانی فیكریی‌و سیاسیی ئەو خـەڵك‌و كۆمەڵگایـە كـە دەیـەوێ

قسەیان بۆ بکاتو، بەرەو خوایان بێنێت، دەبێ شارەزای هەموو ئەوانە بێت.

ئەمیش ئایەتێکی موبارەك کە هەردووکیان دەگرێتە خۆی: خوا بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: ﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٠٨﴾یوسف، واتە: تۆ بفەرموو: ئەوە ڕێبازی منە، لەبەر ڕۆشنایی دا خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکەم، خۆمو شوێنکەوتووانمو، پاکیی بۆ خوا، من لە هاوبەشدانەران نیم.

یەکێك لە سیفەتەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران، ئەوەیە کە بە نەزانییو بە لاسایی کردنەوەی کوێرانە، شوێن شتان دەکەوێ.

وشەی: (عَلَىٰ بَصِيرَةٍ ) واتە: لەبەر ڕۆشنایی دا، یانی: ١- شارەزای خۆمو شوێنکەوتووانم، ٢- لە واقیع شارەزام، ٣- لە ڕێبازەکەم شارەزام، هەموویان دەگرێتەوە.

**سێیەم: هەبوونی نەخشەو بەرنامە + کاری دامەزراوەیی + ڕاوێژکردن:**

**١- هەبوونی نەخشەو:**

**کار بە بەرنامە، تەماشای ئەم ئایەتە موبارەکە بکەن: خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩ ﴾العنكبوت، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، ڕێبازەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین.**

**لە هەموو قورئاندا، وشەی (سُبُل) پاڵدرابێتە لای خوا، لێرەدایە، ئەگەرنا هەر بە (سَبیل) هاتوە، چونکە کارکردن بۆ ئایینی خوا، چۆنیەتیو شێوازو ئامرازی زۆرو جۆراو جۆری هەن، هەڵبەتە مەبەست لە (سبیل) لە قورئاندا: ئیسلامە، کە یەك ڕێبازەو کۆناکرێتەوە، بەڵام مەبەست لە (سُبُل) لێرەدا: شێوازەکانی بانگەواز کردنە، یانی: ئەو شێوازانەی کە بە ڕەزامەندی ئێمەیان**

دەگەیەنن، هەر کەسێك بە ئیخلاصەوە لە پێناوی ئێمەوە تێبکۆشێ، لەو شێوازانەی شارەزا دەکەین.

٢- کاری بە دامەزراوەیی:

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ الله يُحِبُّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ}[٣٨]. واتە: واتە: بە دڵنیایی خوا حەز دەکات، هەرکات یەکێك لە ئێوە کارێکی کرد، بە وردەکاریی بیکات.

٣- ڕاوێژکردن:

خـوای زانـاو شـارەزا فەرموویـەتی: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾﴾الشورى، واتە: کاروباری بڕواداران بە ڕاوێژە، کاروباری سیاسیەتیان، هی بانگەوازیان، هەر جمو جوڵو چالاکییەکیان.

---

٣٨) أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي فِي "شعب الإيمان" برقم: ٥٣١٢، وَأَبُو يَعْلَى برقم: ٤٣٨٦.

ئێستاش با ئەو سێكوچكەیە: {نەخشەو بەرنامە + دامەزراوە + ڕاوێژ} تۆزێك شی بكەینەوە:

یەكەم: مەبەستمان لە: (كار بە نەخشەو بەرنامە)، واتە: كاری بانگەواز، ئەوەیە كە نەخشەو بەرنامەیەكی وردو واقیع بینانە دابنرێ، یانی: ئێمە وەك لایەنێكی ئیسلامیی، ئایا دەبێ هەر كەسێكمان لە ڕاست خۆی هەڵسێتەوەو چی پێ باش بێت باسی بكات؟ نەخێر، بەڵكو:

پێویستە سەرەتا لەسەر بناغەی ڕاوێژ، نەخشەو بەرنامەیەك دابنرێ، قۆناغ بە قۆناغی ئەم كاری بانگەوازە، دیاریی بكرێ، پێشێ خەڵك بانگ بكرێ بۆ تێگەیاندن و پێگەیاندیان، ئنجا دوایی هۆنینەوەو ئامادە كردنیان، نەك هەر قسەی خێر بۆ خەڵك بكەی و بڕۆی، ئەوە وەك ئەوە وایە، كەسێك دەغڵێكدا بچێنێ، بەڵام دوایی لێی نەپێچیتەوە، داخۆ بزن و مەڕی خەڵك دەیخوات، مڵە لێی دەدات، چۆلەكە دەیخوات چی لێ دێت ئاوا

نابێـت، پێغەمبـەری خـواش ﷺ وا نـەبووە ئامۆژگـاریی خـەڵك بكاتو دوایی وازیان لـێ بـێنێ! چـونكە هەنـدێك كـەس ئـەوە لـە ئێمە بە ڕەخنە دەگرن، دەڵـێن: ئێـوە ئامۆژگـاری خۆتـان بكـەنو بڕۆن، نەخێر، دەبێ دواتر كاریان لەسـەر بكـرێ، پێغەمبـەر ﷺ هـاوەڵانی بـانگ كـرد، هۆشـیاری كردنـەوە، دوایـی ئەوانـەی كـە هۆشیار بـوو بوونـەوە، مشووری لێخـواردنو پـەروەردەی كـردنو ئامادەی كردن، ئەگەرنا دوای خۆی، پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ كـێ بوو بە هاوكـاری؟ هەڵبەتـە ئـەو هاوەڵـە بەڕێزانـەی بـوون، ئنجا ئەگەر پـەروەردە نـەكرابانو تێنەگەیـەنرابانو پێنەگەیـەنرابان، چۆن درێژەیان بە كاروانەكەی دا، كەواتە: ئەمە چـەمكی كـار بـە نەخشەو بەرنامەیە.

دووەم: مەبەستیشمان لە: (كـاری دامـەزراوەیی) ئەوەیـە كارەكـان بەسەر پسپۆڕانو شارەزایان دابەش بكـرێن، نـەك بـە شـێوەیەكی هەڕەمەكییو كەس ئاگای لە كەس نەبێت.

بۆ وێنە: ئێستا ئێمە کەسانێکمان هەن کە بە تایبەت خەڵك فێری قورئان بکەن‌و، هەندێك بە تایبەت خەریکی فەرمایشتەکانی پێغەمبەرن‌و، هەندێکی دیکە خەریکی فێر کردنی زانستە شەرعییەکانن، هەندێکی دیکە خەریکی کاری ڕاگەیاندنن، ئنجا ئەوە دەبێ زیاتر تۆخی بکەینەوە.

هەم نەخشەو بەرنامەکە وردتر دابنێین، هەم دامەزراوەکانی کاری بانگ کردنمان بۆ لای خواو بۆ لای ئیسلام، باشترو تۆکمەترو پسپۆڕانەتربن.

سێیەم: مەبەستیشمان لە ڕاوێژ کردن، ئەوەیە کە لە هەموو کارو قۆناغەکان بکۆڵرێتەوە، لەسەر بناغەی ڕاوێژ کردن‌و، بڕیاری تاکەکەسیی‌و سەر پێی‌و نەکولێنراوو کرچ‌و کاڵ، نەدرێ، کە ئەوەش لە ڕاستیی دا ئەگەر بویسترێ هەقی خۆی لێ بدرێ، وەك مسوڵمانەتیی‌و دینداریی، دەبێ لە کەوڵ‌و چوار چێوەی حیزبێکی دیاریی کراو بێینە دەرێ، چونکە خوا کە دەفەرموێ:

﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾الشـورى، خـوا نەیفـەرمووە: بـا کـارو باری (فڵان لایەن‌و فڵان حیـزب) بـە ڕاوێـژبێ، بـەڵكو مەبەسـت هـەموو مسـوڵمانانە، بـە تایبـەت لـە بـواری بانگـەواز و خـەڵك هۆشیار کردنەوەدا، دەبـێ زیـاتر کـار بکـەین‌و هاوکـاربین لەگـەڵ هەموو ئەوانەی کـە خـەڵك بـۆ لای خـوا بـانگ دەکـەن، پێویسـتە هاوکـاریی‌و لێکتێگەیشـتنمان هـەبێ، پشـتی یەکـدی گرتنمـان هەبێ.

هەندێ جار هەنـدێ کـەس قسـان دەکـات، پـێم وایـە ئیسـلام زۆر لەسەری قەرزدار دەبێتـەوە، ئەوانـە نیـە کـە دانـراون بـۆ ئـەوەی بەلبەلە بنێنەوەو، دڵە ڕاوکە بخەنە دڵی مسـوڵمانانەوە بەرانبـەر بـە ئایینەکـەیان، کـە هـەر جـارە بابـەتێك دەورووژێـنن، بـە نەزانیی‌و ناشایستەیی، کە بە شایەنی ئەوەیان نـازانم: نـە ئامـاژە بە بابەتەکان بکەم، نە ئاماژە بە کەسـەکان بکـەم، کـە پـێم وایـە زۆرزانانە، یان نەزانانـەو کـڵاو لەسـەرنراوانە بـە کـرێ گـیراون‌و،

دەستیان لە پشت دەدرێ، ئەگەرنا ئەو هەموو بابەتانـەی ئیسلام هەن، ئەو هەمووو ئایەتانـەی قورئـانو فەرمایشتانەی پێغەمبـەر ﷺ، کە مسوڵمانان پێویستیانە بۆیان باس بکرێن، چیت داوە لـە دوو ســێ مەســەلە، کــە مشــتو مڕێکیــان لەســەرە، یــاخود باسکردنیان بەو شێوازە ناشێیە، بۆ مسوڵمانان دەبێتە ئیشکالێك، ئەگەر ڕاستە کابرا مەبەستی ئەوەیە خەڵك لە دین تێبگات!

بەڵکو مەبەستم هەندێ کەسی دیکەیە کە بـە نـەزانیو ناشـێیی، لە ئەنجامی شارەزا نەبوون لە دینو ئاشـنا نـەبوون بـە ژیـنو لـە ئـەنجامی ئـەوەدا کـە ڕاوێـژکردن نیـەو کـاری دامـەزراوەیی نیـە، هەڵەو پەڵەو کرچو کاڵیی زۆر پەیدادەبێ.

چوارەم: ڕەچاو کردنی پلەپلەییو، دیاریی کردنی لە پێشترەکان:

ئەمەش بنەمایەکی زۆر گرنگـەو، دەبـێ لـە کـاری بانگەوازمانـدا: هەم پلەپلەیی ڕەچاو بکرێ، هەم دیـاریی کردنـی لـە پێشـترەکان، گرنگیــی پێبــدرێ، ئایــا چ شــتێك لــە پــێش چ شــتێکەوەیە؟

هەرچەندە جاری دیکەش باسمان کرد، بەڵام ئەو مەسەلەیە هەرچەندە باسی بکەین، هەر دەیهێنێ، ئەمەش حەوت نموونە لە ئایەتەکانی قورئانو دەقەکانی سوننەت، کە زۆر بە ڕوونی پێویست بوونی هەر کام لە:

أ/ ڕەچاوکردنی پلەپلەیی.

ب/ دیارییکردنی لە پێشترەکان

تێیاندا دەدرەوشێنەوە:

١)- لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتەکانی: (٥٩ و ٦٥ و ٧٣ و ٨٥)دا هەر کام لە {نووح و هوودو صالحو شوعەیب} (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) یەك ڕستە دووبارە دەکەنەوە، دەڵێن: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ۝٥٩﴾، واتە: ئەی گەلەکەم! بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، جگە لەو هیچ پەرستراوێکی دیکەتان نیە.

**پێغەمبەران هەموویان لێرەوە (لە خوا بە یەکگرتن‌و تەنیا خواپەرستن (توحید)ەوە} دەستیان پێکردەوە، ئەوە بناغەیە، خەڵك بانگ کردن بۆ تەنیا خواپەرستیی بناغەو جەوهەری بەرنامەو پەیامی خوای پەروەردگارە.**

٢- {عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الزِّنَادِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ أَخْبَرَنِي رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: رَبِيعَةُ بْنُ عَبَّادٍ مِنْ بَنِي الدِّيلِ وَكَانَ جَاهِلِيًّا قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فِي سُوقِ ذِي الْمَجَازِ وَهُوَ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ! قُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ تُفْلِحُوا وَالنَّاسُ}[٣٩].

**واتە: پێغەمبەری خوا ﷺم دی لە بازاڕی زیلە مەجاز (کە بازاڕێکی سەردەمی نەفامیی بووە) بەسەر خەڵکەوە دەگەڕا، دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە! بڵێن: تەنیا خوا پەرستراوە، سەرفراز دەبن.**

**پێغەمبەری خوا (محمد)یش ﷺ، هەر بەوە دەستی پێکردوە.**

---

٣٩) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: ١٦٠٢٣، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره وهذا إسناد حسن من أجل عبد الرحمن بن أبي الزناد.

٣- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: فُرِضَتْ الصَّلَاةُ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ هَاجَرَ النَّبِيُّ ﷺ فَفُرِضَتْ أَرْبَعاً، وَتُرِكَتْ صَلَاةُ السَّفَرِ عَلَى الأُولَى}(٤٠).

**واته: دایكمان عائیشه خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: نوێژ كه فەرز كرا، دوو ڕكات بوو، بەڵام دوایی كه پێغەمبەر ﷺ كۆچی كرد بۆ مەدینه، نوێژه چوار ڕكاتییەكان فەرز كران، بەڵام نوێژی سەفەرێ هەر لەسەر حاڵەتی پێشێی مایەوە.**

٤- {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمَّا بَعَثَ مُعَاذاً رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَلَى الْيَمَنِ قَالَ: إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلَى قَوْمِ أَهْلِ كِتَابٍ، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ عِبادَةُ اللهِ، فَإِذَا عَرَفُوا اللهَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ، فَإِذا فَعَلُوا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ زَكاةً مِنْ أَمْوالِهِمْ وَتَرَدُّ عَلى فُقَرائِهِمْ}(٤١).

---

٤٠) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيّ برقم: ٣٩٣٥.
٤١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيّ برقم: ١٤٥٨.

**واتــه: عەبـدوڵلای کـوڕی عـەبباس خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەڵـێ: کاتێـك پێغەمبـەری خـوا ﷺ موعـازی کـوڕی جەبـەلی نـارد بـۆ یەمەن پێی فەرموو: تۆ دەچیە لای کۆمەڵە خەڵکێك، کە خـاوەن کتێبن، با یەکەمین شتێك کە ئەوانی بۆ بانگ دەکەی ئەوەبێ کە خوا بپەرستن (کە پێشـتر بـە هەڵە پەرسـتوویانە)، ئنجا ئەگـەر خوایان ناسیی، پێیان ڕابگەیەنە کە خوا پێـنج نوێـژی لـە ڕۆژوو شەوێکدا لەسەر پێویست کـردوون، ئنجا ئەگـەر ئەوەشـیان کـرد، هەواڵیان پێبدە کە خوا دوایی زەکاتی لە ماڵو سامانیاندا لەسـەر پێویست کردوون کە بگێڕڕێتەوە بۆ هەژارەکانیان.**

٥ـ {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: إِنَّمَا نَـزَلَ أَوَّلَ مَـا نَـزَلَ مِنْـهُ: سُـورَةٌ مِـنْ الْمُفَصَّـلِ فِيهَـا ذِكْـرُ الْجَنَّـةِ وَالنَّـارِ، حَتَّـى إِذَا ثَـابَ النَّـاسُ إِلَـى الإِسْـلاَمِ، نَـزَلَ الْحَـلاَلُ وَالْحَـرَامُ وَلَـوْ نَـزَلَ أَوَّلَ شَيْءٍ: لاَ تَشْرَبُوا الْخَمْرَ لَقَالُوا: لاَ نَدَعُ الْخَمْرَ أَبَدَاً، وَلَوْ نَـزَلَ لاَ تَزْنُوا لَقَالُوا: لاَ نَدَعُ الزِّنَـا أَبَدًا}[٤٢].

---

٤٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِيّ برقم: ٤٩٩٣.

(ڕۆژێك پیاوێكی عیراقیی چووه بۆ لای دایكمان عائیشه خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: دایكی بڕواداران موصحەفەكەی خۆتم پێشان دەدەی؟ گوتی: بۆچیته ڕۆڵه؟ گوتی: دەمەوێ نوسخەكی لەبەر بگرمەوە، ئەویش گوتی: لە كوێوە بیخوێنەوە هەر تەواوە)، دوایی گوتی: یەكەمین شتێك كە خوا دایبەزاند لە قورئان سوورەتە كورتەكان بوون، كە باسی دۆزەخ و بەهەشت (و بابەتە عەقیدەییەكان) دەكات، هەتا كاتێك خەڵك بۆ ئیسلام گەڕایەوە (واتە: بووناسییو ئیمان و عەقیدەیان بۆ دروست بوو) ئنجا باسی حەڵاڵو حەرام دابەزی، ئەگەر یەكەمجار خوا فەرمووبای: شەراب مەخۆنەوە، دەیانگوت: هەرگیز وازی لێناهێنین، هەروەها ئەگەر یەكەمجار فەرمووبای: زینا مەكەن، دەیانگوت: هەر گیز وازی لێناهێنین.

بەڵام پێشێ بووناسییو ئیمانو عەقیدە، لە دڵو عەقڵیاندا جێگیر بوو، ئنجا دوایی تەكلیفە شەرعییەكانی دیكە دابەزین.

٦ـ {عَنْ وَهْبٍ قَالَ سَأَلْتُ جَابِرًا عَنْ شَأْنِ ثَقِيفٍ إِذْ بَايَعَتْ قَالَ: اشْتَرَطَتْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ أَنْ لاَ صَدَقَةَ عَلَيْهَا وَلاَ جِهَادَ، وَأَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ يَقُولُ: «سَيَتَصَدَّقُونَ وَيُجَاهِدُونَ، إِذَا أَسْلَمُوا»}(٤٣).

**واتە: وەهبی کوڕی مونەبیە دەڵێ: پرسیارم لە جابر کرد دەربارەی هۆزە سەقیف کاتێ پەیمانیان بە پێغەمبەردا ﷺ، کە مسوڵمان بوون چۆن بوو؟ گوتی: لەسەر پێغەمبەریان ﷺ بە مەرج گرت، زەکاتێ نادەنو، جیهادیش ناکەن، پێغەمبەریش ﷺ، لێی قبووڵ کردن،، بەڵام دوایی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر مسوڵمان بوون، زەکاتێش دەدەنو جیهادیش دەکەن. کە هەر واش بوو.**

٧ـ {عَنْ نَصْرِ بْنِ عَاصِمٍ اللَّيْثِيِّ عَنْ رَجُلٍ مِنْهُمْ، أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَأَسْلَمَ عَلَى أَنْ يُصَلِّيَ صَلاَتَيْنِ، فَقَبِلَ مِنْهُ}(٤٤).

---

٤٣) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: ٣٠٢٥، وَصَحَّحَهُ الأَلْبَاني في "الصَّحِيحَة" برقم: ١٨٨٨.
٤٤) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: ٢٠٣٠٢.

واتە: نەصرِی کورِی عاصمی لەیثی لە پیاوێك لە خۆیانەوە، دەگێرِێتەوە، کە چۆتە لای پێغەمبەر ﷺو، مسوڵمان بووە، بەو مەرجە تەنیا دوو نوێژان بکات، (شەوو رِۆژ دوو نوێژان بکات)، پێغەمبەریش ﷺ، ئەوەی لێ قبووڵ کردوە!

خوشك‌و برا بەرِێزو خۆشەویستەکانم!

بێگومان هیچ کەسێك، بۆی نیە موزایەدەی دینداریی بە سەر پێغەمبەرەوە ﷺ بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ، کە خوای زاناو شارەزا پێی فەرمووە، کە بلێ: ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ١٦٣﴾الأنعام، واتە: من یەکەمی مسوڵمانانم، بەڵام تەماشا دەکەین، پێغەمبەر ﷺ، لە هۆزی سەقیفی قبووڵ کردوە، زەکات نەدەن‌و جیهاد نەکەن، هەروەها لەو پیاوەی قبووڵ کردوە، کە گوتوویەتی: تەنیا دوو نوێژان دەکەم! لەوانەیە کابرا گوتبێتی: تەنیا ئەو دووانە دەکەم، ئنجا ئەگەر دەڵێی مسوڵمان دەبم، ئەگەرنا مسوڵمان نابم؟ ئەویش فەرموویەتی: مسوڵمان بە، بۆچی؟

چونكه با مسوڵمان بێ، ئەگەر تەنیا دوو نوێژانیش بكات، باشترە لەوەی مسوڵمان نەبێو نوێژ نەكاتو سەجدە نەباتو ڕكووع بۆ خوای بەرزو بێ هاوتا نەبات!

ئنجا ئێمە لەم دەقانە هەروەها لەوانی دیكەش، ئەوەیان لێوەردەگرین، كە لە بواری بانگەوازدا، دەبێ هەم پلەپلەیی ڕەچاو بكەین، هەم لە گرنگترەوە بۆ گرنگتر چوون، واتە چ شتێك لە پێش چ شتێكەوەیە؟ هەروەها چ شتێك ئەسڵی دینەو، چ شتێك فەرعی دینە؟ بەبێ ئەوە لە كارەكەماندا سەركەوتوو نابینو، لەو بارەشەوە، هەڵەو پەڵەی زۆر هەیە، كە دوایی لە تەوەری نۆیەمدا، لەو بارەوە هەندێك شت باس دەكەینو، بۆ وێی هەڵدەگرین.

پێنجەم: دڵخۆش كردنو ئاسانكردن:

خەڵك بانگكردن بۆ لای خوا، بە كەسێك دەكرێ، بە ڕاستی بتوانێ هەم خەڵكی دڵخۆش بكات، وە هەم بۆیان ئاسان بكات،

سەرنجیان ڕابكێشێ‌و، وایان لێبكات، كە متمانەیان پێی بێ‌و، وایان لێبكات، ئەوان، ئەو بە دڵسۆز بزانن، ئەگەر وانەبێ، گوێی بۆ ناگرن‌و، قسەی لێوەرناگرن:

با لەوبارەوەش سەرنجی چەند دەقێكی شەریعەت بدەین:

١)- خوا سبحانە وتعالى لە سوورەتی (النساء)دا ناوی دوازدە (١٢) لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) دێنێ‌و، هەمووشیان بە دلخۆشكەرو ترسێنەر (مبشر ومنذر) وەسف دەكات، دەفەرموێ:

﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ

إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ

وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلٗا

قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ

ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ

لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ النساء.

واته: ئێمه سروشمان بۆ لای تۆ ناردوه، وەك چۆن سروشمان بۆ لای نووحو پێغەمبەرانی دوی ویش نارد، هەروەها سروشمان بۆ لای ئیبراهیمو ئیساعیلو ئیسحاقو یەعقووبو ئەسباطو عیساو ئەییوبو یونوسو هارِوونو سولەیمان ناردو زەبووریشمان بە داوود دا . وە پێغەمبەرانێك کە پێشتر بەسەرهاتیانمان بەسەرتدا خوێندۆتەوەو پێغەمبەرانێك کە بەسەرهاتیانمان بەسەرتدا نەخوێندۆتەوە، وە خوا بە قسە کرد فەرمایشتی لەگەڵ مووسادا کرد . پێغەمبەرانێکی موژدەدەرو ترسێنەرن تاکو دوایی هاتنی پێغەمبەران خەڵك بەڵگەی لەسەر خوا نەبێ، وە خوا زاڵی کارزانە.

واته: ئەوانە پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەرو ترسێنەر بوون، یاخود (مُّبَشِّرِينَ )، موژدە دەرو وریا کەرەوە بوون، بۆچی؟ تاکو لە دوای هاتنی پێغەمبەران، خەڵك بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا.

کەواتە: پێغەمبەران هەموویان (علیهم الصلاة والسلام)، سیفەتی بنچینەییان ئەوە بووە، خەڵك دڵخۆش بکەن، بە پاداشتی خوا، خەڵك دڵخۆش بکەن، بەوە کە دینداریی لە دنیادا، بەرهەمی باشی دەبێو، دڵخۆشیشیان بەوەی کە خواپەرستییەکەیان لە دوارِۆژیشدا، بەرهەمی باشی دەبێ، ئایا دەزانن، پێغەمبەر ﷺ، کە قورەیشیەکانی بۆ ئیسلام بانگ دەکرد، چی پێ دەفەرموون: کاتێك مامی پرسیاری لێکرد چی لێیان دەوێ: دەیفەرموو: {«يَا عَمِّ أُرِيدُهُمْ عَلَى كَلِمَةٍ تَدِينُ لَهُمُ الْعَرَبُ وَتُؤَدِّى إِلَيْهِمُ الْعَجَمُ الْجِزْيَةَ»، قَالَ: مَا هِيَ؟ قَالَ: «شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ»} (أخرجه الترمذي: ٣٢٣٢، قال أبو عيسى هذا حديث حسن، والبيهقي في الكبرى: ١٩١٢٠، وقال الألباني: ضعيف الإسناد).

واتــه: ئــەی مامــە گيــان! تــەنيا وشــەيەكم لێيــان دەوێ، كــە حكـومڕانيى بەســەر گــەلى عەرەبــدا، پێدەكــەن‌و، عەجــەميش سەرانەتان دەدەنێ‌و بۆتان ملكەچ دەبن.

واتە: ئەم دينە، هەرچەندە بەرهەم‌و بەرەكەتەكـەی، بـە شـێوەی ئەساسيى، لە دوارِۆژدايە، چونكە ژيـانی دنيـا شـتێكی وا نيـە، لـە چـاو دوارِۆژو شـتێكی كەمۆكەيـە، وەك خـوا دەفـەرموێ: ﴿فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ٣٨﴾التوبــة، واتــە: ڕابواردنی ژيانی دنيا لە چاو هی دوارِۆژدا كەمۆكەيە.. بەڵام ئـەم دينە، وەك چۆن دوارِۆژمان باش دەكات‌و، دنياشمان بـاش دەكـات، لە دنياشدا خێرو بەرەكەتی پێوەيە بۆ خەڵك، بانگەوازكار دەبـێ لێی بزانێ‌و، خەڵك دڵخۆش بكـات: فلانكـەس! تـۆ وەرە، تـۆ وەرە مسوڵمان بە، هەم خوا لێت ڕازيی دەبێ، هـەم لـە دنياشـدا لەشـت ساغ دەبێ، ماڵ‌و خێزانت چاك دەبێ، لە عەيبـداريی دوور دەبـی، لە گوناهباريی دوور دەبی، ساغ‌و سەلامەت دەبی ... هتد.

هەروەها پاشان ئاگادار کردنـەوەو ترسـاندنی خـەڵکیش، ئـەویش بە تەئکید، یەکێکە لە لایەنە ئەساسییەکانی دینداریی.

٢)- هەروەها خوا عز وجل دەفـەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ١٨٥﴾البقـرة، واتـە: خـوا ئاسـانیی بۆتـان دەوێ‌و، زەحمـەتی بۆتـان نـاوێ، ئـەم ئایەتـە لـە سـیاقی باسـی ڕۆژووی مـانگی ڕەمەزانـدا هـاتوە، کـە لـە کـاتی نەخۆشـیی‌و سـەفەردا، بۆتـان هەیـە، ڕۆژوو نـەگرن‌و، دوایـی بیگێڕنـەوە، لـەو سیاقەدا، خـوا دەفـەرموێ: خـوا ئاسـانیی بۆتـان دەوێ، زەحمـەتی بۆتان ناوێ.

کەچـی - وەك دوایـی بـاس دەکـەین - هەنـدێك کـەس هەمیشـە ئەگــەر مەســەلەیەکی شــەرعیی، دوو بــاری هــەبن، بــارێکی زەحمەت‌و بارێکی ئاسـان، تـەنیا ملـی زەحمەتەکـەی دەگـرن، کـە ئـەوە ڕێـك پێچـەوانەی ئـەم ئایەتەیـە، هـەروەها پێچـەوانەی

**ئەوەشە کە، دایکمان عائیشە، خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە:**

٣)- {مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَمْرَيْنِ أَحَدُهُمَا أَيْسَرُ مِنَ الآخَرِ، إِلاَّ اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا، مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمَاً، فَإِنْ كَانَ إِثْمَاً، كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ}[٤٥].

**واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ، هیچ کات سەرپشك نەکراوە، لە نێوان دوو ئیشاندا کە یەکێکیان لەو دیکەیان سێناتر بووبێ، مەگەر کامەی ئاسانە، ئەوی هەڵبژاردوە، ئەگەر گوناح نەبووبێ، بەڵام ئەگەر گوناح بووبێ، لە هەموو کەس لێی دوورتر بووە، بۆ وێنە: ئافرەت بۆی هەیە، نیقاب بکات، بۆیشی هەیە نەیکات، دەمو چاوی دیار بێ، کەچی ئەوان دەڵێن: هەر دەبێ پێچە (نقاب) بکات.**

**بە ڕاستیی سەیرە!**

---

٤٥) أَخْرَجَهُ البُخَارِيّ برقم: ٣٥٦٠، وَمُسْلِمٌ برقم: ٢٣٢٧.

له هەندێك وڵاتانی عەرەبیدا، شتی بچووکی وەك پێچەگرتنەوە (إنتقـاب)و دامـێن هەڵپێچـان (تشـمیر الپـوب) زۆر بـە سـەختی دەگـرن، بـەڵام شـتی گـەورە گـەورەیان، زۆر ئیهمـال کـردوە، بـۆ نموونە: ئایا حـوکمڕانیی شووڕاییە، وەك قورئـان فەرمووویـەتیو پێغەمبـەری خـوا کردوویـەتی، یـان بنەماڵـەیی، میراتییـە، وەك ڕۆژگاری نەفامیی؟! هیچ لەوە ناپێچنەوە.

بـرای مـوفتی! ئەگـەر بـە تـەنگ دیـنی خـواوەی، بۆچـی لـەوەش ناپێچیەوە، کە چارەنووسی عیبادو بیلادی پێوە گرێداوە؟!

٤)- هـەروەها پێغەمبـەر ﷺ، زۆر بـە ڕوونیـیو بـە ڕاشـکاویی، دەفەرموێ: {بَشِّرُوا ولا تُنَفِّروا، ويَسِّرُوا ولا تُعَسِّرُوا}(٤٦).

واتــە: دڵخۆشــکەر بــنو ســڵەمێنەرەوە مــەبن، {خــەڵك مەسـڵەمێننەوە، خـەڵك دوور مەخەنـەوە} هـەرووەها ئاسـانکەر بنو، وەزەحمەتخەر مەبن.

---

٤٦) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: ٦٩، وَمُسْلِمٌ: ١٧٣٤.

**شەشەم: ئیقناع کردنی عەقڵو جووڵاندنی دڵ:**

پێشتر باسمان کرد، خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴿١٢٥﴾ ﴾النحل، حیکمەتەکە بۆ عەقڵ، ئامۆژگاریی چاکیش بۆ دڵو دەروون، مرۆڤ هەم عەقڵەکەی دەبێ ئیشباعو تێر بکرێو، ئیقناع بکرێ، هەم دڵو دەروونەکەی، پێویستە بجوڵێنرێ، چونکە جاری وای، مرۆڤ بە عەقڵ شتێك دەزانێ، بەڵام هەتا ئەو زانیارییە، لە عەقڵەوە تەحویل نەبێ بۆ دڵ، نایجووڵێنێ، پێغەمبەر ﷺ، دەربارەی خەواریجی دەفەرموێ: {يَقْـرَؤُونَ الْقُـرْآنَ، لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ}[٤٧]، واتە: قورئان دەخوێنن، بەڵام، لە گەروویان، ئەودیو نابێ، واتە: نایەتە نێو دڵو دەروون، نەبۆتە هۆی ئەوەی دڵو دەروونیان: ڕووناکیی ئیمانو، تامی تەقواو، تەزووی بەهاو

---

٤٧) أَخْرَجَهُ البُخَاري برقم: ٦٥٣١، وَمُسْلِمٌ برقم: ١٠٦٦.

ئاكـاره بـەرزەكانی، وەك: میهرەبـانییو بـەزەییو پـەرۆشو ...

هتدی تێكەڵ بێ، هەوا بە وشكی، ئایەتەكانیان گرتوە.

هەڵبەتـە، ئیقنـاع كردنـی عـەقڵو، جووڵانـدنی دڵ، نـەك هـەر

مەنهـەجی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، بووبـێ، بـەڵكو هـەموو

پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وا بوون، بۆ وێنە:

لـە سـوورەتی (إبـراهیم)دا، كـە خـوا سـبحانه و تعـالی، لـە یـەك

شـوێنداو پێكـەوەو وێكـڕا باسـی هـەموو پێغەمبـەران (علـیهم

الصلاة والسلام)، دەكات، دەفـەرموێ: ﴿قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ أَفِي ٱللَّهِ

شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَدۡعُوكُمۡ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ

١٠﴾ إبراهیم.

كە لێرەدا هەم عەقڵیان، دەدوێنن، هەم دڵیان دەجووڵێنن:

**أ/ عەقڵیان دەدوێنن‌و، ئیقناع دەکەن، بەوە کە دەفەرموون: (أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ)، واتە، ئایا دوو دڵیی هەیە لە خوادا، کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان‌و زەوییە؟ واتە: ئاشکرایە کە ئەم ئاسمان‌و زەوییە، وەدیهاتوون‌و، دەبێ بەدیهێنەرێکیان هەبێ، ئایا لەم ڕاستییەدا دوو دڵیی هەیە؟ ئەدی نابێ هەموو پەیداکراوێك، پەیداکەرێکی هەبێ، ئەوە بۆ عەقڵ.**

**ب/ بۆ دڵیشیان دەفەرموون: (يَدۡعُوكُمۡ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ)، ئەو پەروەدگارەتان، بانگتان دەکات، تاکو لە گوناهەکانتان بتانبووریٚ، یانی: کە بانگتان دەکات، بۆ بەرژەوەندیی خۆتانەو، هیچ ئیشی خۆی بە ئێوە نیە، بەڵکو ئیشی خۆتانی بە خۆتانە.**

**حەوتەم: بیر خستنەوەی چاکەکانی خوا:**

**براو خوشکەکانم!**

**پێویستە ئەم بنەمایەش زۆر زۆر گرنگیی پێبدەین، چونکە خوا لە قورئانـدا سبحانە وتعالی، زۆر گرنگیی پێـداوەو، زۆری باس کردوە، بۆ وێنە:**

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ۝٣﴾فاطر، **واتە: ئەی خەڵکینە! یادی چاکەی خوا بکەنەوە، بەسەر خۆتانەوە، ئایا جگە لە خوا، بەدیهێنەرێکی دیکە، لە ئاسمانو زەوی، {واتە: لە سەرو خوارەوە}، بژیوتان دەدا؟** (لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ)**، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیەو، هەر ئەو**

پەرستراوە، (فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ)، بۆ كوێ لادەدرێن! یانی: كۆنتڕۆڵی خۆتانتان، لە دەست داوە.

٢)- ﴿أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَـٰهِرَةً وَبَاطِنَةً...﴿٢٠﴾﴾لقمان، واتە: خوا هەرچی لە ئاسمانەكانو زەویدا هەیە، بۆ ئێوەی دەستەمۆ كردووەو، چاكەكانی خۆی، بە ئاشكراو پەنهان، لەسەر ئێوە تەواو كردوون...

٣)- هەروەها بەڕێزان! تەماشای ئەم سێ ئایەتە بكەن، چەند ڕاچڵەكێنەرن! خوا دەفەمویٚ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَـٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِى خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِىٓ أَىِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾﴾الإنفطار.

واته: ئەی مـرۆڤ! (مـن، تـۆ، هـەموومان، چ مسـوڵمان، چ كـافر) چ شـتێك، لـە بەرانبـەری پـەروەردگاری بەخشـندەتدا، تـۆی بـوغرڕا كردوە، {(غَرَّكَ)، یانی: فریوی داوی، بوغرڕای كردووی، لـە كـەوڵی خـۆتی دەرچـواندووی؟} ئنجـا ئـەو پـەروەردگارە، بەخشـندەو بەڕێزت، چی كردوە؟

١- قۆناغی یەكەم: (ٱلَّذِى خَلَقَكَ)، تۆی بەدیهێناوە، تـۆی هێناوەتـە دیو، بوونی پێداوی.

٢- قۆنـاغی دووەم: (فَسَوَّىٰكَ)، ڕێكـی خسـتووی، چـونكە دەگونجـا، مرۆڤ پارچە گۆشـتێك بـێ، بـەڵام خـوا ئەندامـەكانی بـۆ دروسـت كردووی.

٣- قۆناغی سێیەم: (فَعَدَلَكَ)، ئنجا، هاوسەنگی كردووی، دەگونجا، دەستێكت لە دەستێكت، یـان قاچـێكت لـە قاچـێكت، درێـژتر بـێ،

یان چاوێكت له‌ چاوێكت گه‌وره‌تر بێ، به‌ڵام به‌ خوا ته‌عدیلی كردووی!

٤- قۆناغی چواره‌م: (فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ )، له‌ هه‌ر وێنه‌یه‌كدا، له‌ هه‌ر دیمه‌نێكدا، كه‌ ویستوویه‌تی، تۆی پێك هێناوه‌، كه‌واته‌: خوا به‌ چوار قۆناغ، تۆی هێناوه‌ته‌ دی، بۆچی به‌رانبه‌ر به‌ په‌روه‌ردگارت، ئاوا له‌ خۆبایی؟ یاخود ئاوا فریو دراوی؟

به‌ڵێ نیعمه‌تو چاكه‌كانی خوا، گرنگه‌ ئینسان بیانخاته‌وه‌ بیر خه‌ڵك، له‌ هه‌ر شوێنه‌و، له‌ هه‌ر مه‌قامه‌، به‌ شێواز گونجاوی خۆی.

هه‌شته‌م: هۆشداریی پێدان‌و ترساندنی خه‌ڵك:

ئه‌وانه‌ی بۆ لای خوا بانگ ده‌كرێن، وێڕای دلخۆشكردن، پێویسته‌ هۆشدارییان پێ بدرێ‌و، بشترسێنرێن، به‌ دڵنیایی من كه‌ ده‌ڵێم:

دەبێ دڵیان خۆش بکرێ، خۆ ناڵێم، حەرامیان بۆ حەڵاڵ بکرێ، هەروەها کە دەڵێم ئاسانکایی بکرێ، مەبەستم ئەوە نیە، سنوورەکانی شەرعیان بۆ ببەزێنرێن، چونکە تۆ ئەسڵەن بۆ لای شەریعەتیان بانگ دەکەی، ئنجا ئەگەر سنوورەکانی شەرع، لەبەر وان ببەزێنی، مانای وایە هیچت نەکرد، پێغەمبەر ﷺیش، کە لەو پیاوەی قبووڵ کردوە، ڕۆژێ دوو نوێژان بکات، نەیفەرمووە: تەنیا دوو نوێژی فەرزن، فەرموویەتی: پێنج (٥) نوێژی فەرزن، بەڵام تۆ تەنیا دووان دەکەیو، فەرموویەتی: دووانیش بکات، باشترە لەوەی، هەر مسوڵمان نەبێ! یان هۆزی سەقیف کە گوتوویانە: زەکاتێ نادەینو جیهادیش ناکەینو، لێی قبووڵ کردوون، نەیفەرمووە: ئەوانە فەرز نین، دەبێ وریا بین! کەواتە: وێڕای خەڵك دڵخۆش کردنو، دینداریی ئاسان کردن، بۆ خەڵك، کە ئەوە بنەمایەکی بانگەوازە، هۆشداری پێدانی خەڵكو ترساندنیشیان، ئەویش دیسان، یەکی دیکەیە، لە بنەمایەکانی

**خەڵك بانگكردن بۆ لای خوا، بـا تـەماشـای ئـەم ئايەتـە موبارەكـە بكەين:**

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ٥ ﴾فاطر.

**واتە: ئەی خەڵكينە! بە دڵنيايی، بـەڵێنی خـوا ڕاسـتەو، مسۆگەر بـن، بـەڵێنی خـوا ڕاسـتە، كـە دەفـەرموێ: زينـدوو دەبنـەوەو، لێپرسـينەوە هەيـە، (فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا)، بـا ژيـانی دنيـا، فريوتـان نـەدا، (وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ)، هـەروەها بـا فريـودەر، بەرانبەر بە خوا، فريوتان نەدات، فريودەر كێيە؟ شەيتانە.**

**لێرەدا شتێكم هاتەوە ياد:**

**لـە سـووڕەتی (الـذاريات)دا، خـوای پـەروەردگار كـە دەفـەرموێ:**

﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ ٢٠ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٢١ وَفِي

ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾، هەنـدێك لـە زانايـان دەڵـێن: (وَمَا تُوعَدُونَ )، پەیوەست نابێتـەوە بـە پێشـەوەی، تـاكو ماناكـەی ئـاوای لـێ بـێ: {بژیوتان لە ئاسمانەو ئەوەش كە بەڵێنتان پێ دەدرێ – ئەویش هـەر لـە ئاسمانـە}. بـەڵكو (وَمَا تُوعَدُونَ ) پەیوەسـتە بـە دوای خۆیەوە بەمجۆرە:

{...وَمَا تُوعَدُونَ ، فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ }

واتـە: ئـەوەی بـەڵێنتان پـێ دەدرێ: ڕزقەكـەتان، وە ئـەوەش، كـە بـەڵێنتان پـێ دەدرێ، هەنـدێكیان (وَمَا تُوعَدُونَ )، ڕەبـت دەكـەن، سوێند بـە پـەروەردگاری ئاسمـانو زەوی، هەقـە وەك چۆن قسـە دەكەن.

یـانی: قسـەكردنەكەتان چـۆن ڕاسـتو چەسـپاوەو، نكـوولێی لێناكرێ، ئەوەی بەڵێنیشتان پێ دەدرێ، ئاوا هەقو ڕاستە!

(الأصْـمَعِي) لێـرەدا، شـتێك دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: كابرایـەكی عـەرەبیی دەشـتەكی جارێـك هـات، گـوتی: ئـەری، لـەوەی خـوا دایبەزاندوە، شتێكم فێر ناكەن! منیش ئەو ئایەتانـەی سـەرەتای سوورەتی (الـذاریات)م فێركـردن: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ ﴾ ، ئنجا یەكسەر دوای گوێ بیستبوونی ئایەتەكان: حوشترەكەی سـەربڕیو گۆشـتەكەی كـردە خێـرو ڕۆیشـت. ئیـدی ساڵێك پێچوو، هاتـەوە، زۆر كـزو لاواز بـوو بـوو، گوتمـان: ئـەوە چـت كـردوە؟ بـۆ وات لێهـاتوە؟ گـوتی: ئـەو ئایەتانـەم جێبـەجێ كردوون، ئەوە نیە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾

الذاريات، دوای ئەوەی حوشترەکەی کردبووە خێر، وەك جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا کە دەبێ ماڵەکەت بدەی، بە سواڵکەرو بێ بەشان، ئنجا شەوێش زۆر کەم خەوتبوو، هەتا پێش بەرەبەیان (سحر)و ئەو کاتەش هەر (إستغفار)ی کردبوو، زۆر بە سەختی گرتبووی‌و، تەواو کزو لاواز بوو بوو، ئنجا گوتی: هاتووم ئەمجارەش هەندێکی دیکەش فەرمایشتی خوام بۆ بخوێنێ، دەڵێ: منیش هەر تەواوکەر (تکملة)ی ئەو ئایەتانەی (الذاريات)م بۆ خوێند: ﴿وَفِي ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِيٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾﴾الذاريات، ئیدی ئەو ئایەتانەم بەسەردا خوێندنەوە:

کابرا یەك چریکەی لێداو، گوتی: ئەوە کێ پەروەردگاری جیهانی تووڕە کردوە، کە دەبێ سوێندی بۆ بخوات، ئنجا بڕوای پێبکات؟! چریکەیەکی لێداو، وەفاتی کرد!

**بەڵێ: وریاکردنەوەو هۆشداریی پێدانی خەڵكو، ترساندنیشیان، یەکێکە لە بنەماکانی بانگەواز کردنی خەڵك، بۆ لای خوا، کەسی وا هەیە، سەد جار بۆی باسی بەهەشتێ بکەی، رزۆر کاریگەریی نەبێ، بەڵام بە هۆی سزاو جەزرەبەی خواوە لە دۆزەخ داو پێش دۆزەخیش، لە عالەمی بەرزەخدا، ڕادەچڵەکێو هۆشیار دەبێتەوە.**

**یاخود هی وا هەیە، لەبەر سزای خوا، لە قیامەتدا، لە گوناه ناپڕینگێتەوە، بەڵام کە زانی لە دنیاشدا زیانی هەیە، لێی دەپڕینگێتەوە! نەفەرم بینیوە، گوتوومە: جگەرە حەڕامە، بەڵام هەر لەسەری بەردەوام بووە، کەچی دوایی کە چووە بۆ لای پزیشكو، گوتوویەتی: تووشی سەڕەتانت دەکات، ئەگەر وازی لێنەهێنی، وازی لێهێناوە!**

**نۆیەم: جەختكردنەوە لەسەر واقیعی ئێستامان و، كێشەو گرفتەكانی كۆمەڵگا:**

هەندێك لە بانگەوازكاران، - وەك دواییش باسی دەكەین - زیاتر لە مێژوودا دەژین، یان مێژوو هەڵدەكۆڵن، بزانن داخۆ چ گرفت و كێشەیەكی تێدا بووە، كاتی خۆی باس كراوە، مشتومڕی لەسەر بووە! دەیهێنن بۆ ئێرە، بەڵام ئێمە كاتێك تەماشای سیرەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەكەین، وایان نەكردوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأعراف)دا، هەر كام لە (نُوح، هُود، صالِح، لُوط، شُعَیْب)[٤٨]، لە سوورەتی (هود)دا، دیسان ئەو پێنجە (٥)یان[٤٩]، لە سوورەتی (الشعراء)دا، دیسان ئەو پێنجەیان (٥)[٥٠]، هەر كامێكیان، ئەوەی بۆ كۆمەڵگایەكەی خۆی باس كردوە، كە پێویستی بووە، نووح علیه السلام زیاتر باسی ئیستبدادی سیاسی كردوە، هوود علیه السلام لە ڕووی

٤٨) ئایەتەكانی: ٥٩ - ٩٣.

٤٩) ئایەتەكانی: ٢٥ - ٩٥.

٥٠) ئایەتەكانی: ١٠٥ - ١٩١.

ئـابووریی‌و كۆمەڵاتییـەوە، دواوە، صـاڵح علیـە السـلام دیسـان لـە ڕووی كۆمـەڵایـەتیی‌و گوزەرانـەوە، لـووط علیـە السلام لـە ڕووی ڕەوشـتییەوە، چـونكە گەلەكـەی ڕەوشـتیان تێكچـووە، شـوعەیب علیە السلام لە ڕووی ئابووریی‌و هێمنیی‌و ئاسایشی خـەڵك‌و، ڕێ لە خەڵك نەگرتنەوە، هەر كـام لـە پێغەمبـەران (علیهم الصـلاة والسلام)، كۆمەڵگایەكەی چ دەردێكی هەبووە، باسی ئـەو دەردەی بۆ كردوون، بۆیە گرفت‌و كێشەكانی ئێسـتای ئێمـەش، كـە جیـان لە هی كۆمەڵگایەكانی ڕابردوو، دەبێ قسـەو گوتاریشـمان جیـاواز بێ.

بـا یـەك وێنـەتان بـۆ بێنمـەوە: ئـەو زانسـتەی ئیمـان‌و عەقیـدە دەكۆڵێتەوە، پێی گوتـراوە: (علم التوحیـد)، دوایـی پێیـان گوتـوە: (الفِقْهُ الأكْبَر)، بەڵام لە سەردەمێكدا، ناوی لێنـرا: (عِلْـمُ الكَـلام)، ئایا دەزانن ئەو ناوە لە چییەوە هاتوە؟ كێشەی هەرە گـەورە، كـە مشـتومڕی زۆری لەسـەر بـووە، ئـەوە بـووە كـە ئایـا: (كـلام الله)، قورئان، ئایا دروستكراوی خوایە؟ یاخود خوا دروسـتی نـەكردوە،

هەر فەرموویەتی؟ كێشەیەكی زۆر لەسەر ئەوە بووەو، ئیمام ئەحمەد، لەسەر ئەوە چەند ئەزیەت درا، ئنجا ئەوە كێشەیەك بوو، كاتی خۆیو، ئیمام ئەحمەد چاكی كرد، دیفاعی كرد، بەڵام، ئێستا ئێمە كێشەمان ئەوە نیە خەڵكێك بڵێ: قورئان مەخلووقە؟، یان مەخلووق نیە؟ ئێستا كێشەمان ئەوەیە، كە دەڵێن: قورئان، هەر لە خواوە نەهاتوە، بەڵكو هەندێك هەر بڕوایان بە خوا نیە، كێشەمان لەگەڵ ئەوانەدا هەیە! دەبێ بزانین، كێشەكانی ڕۆژگاری ئێمە چین؟ نەخۆشییەكانی ڕۆژگاری خۆمان چین؟ نەك بگەڕێینەوە بۆ مێژوو، هەر لە مێژوودا بژینو، ئاگامان لە واقیعی ئێستامان نەمێنێ، كە بە داخەوە، زۆرێك لەوانەی كە لەسەر تەوژمی ئیسلامیی حیسابن، لە مێژوودا دەژینو، كەم پەسوەستن بە ڕۆژگارو واقیعی ئێستاوە.

**دەیەم‌و کۆتایی: جەستاندنی پەیام‌و بەرنامەی خواو، بوونە سەر مەشق بۆ خەڵك:**

**بەڕێزان!**

**لێتان دووبارە دەکەمەوە: زمانی کردەوەو حاڵ، باشترین شێوازی بانگەوازە، تەماشا بکەن، خوا سبحانە وتعالی، بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ، چی دەفەرموێ؟** ﴿نٓ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ﴿٢﴾ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ﴿٤﴾ فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ ﴿٥﴾ بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ ﴿٦﴾﴾القلم.

**واتە: (نٓ)، سوێند بە قەڵەم‌و، بەوەی، کە پێی دەنووسن، {دێڕەکان}، تۆ بە هۆی چاکەی پەروەردگارتەوە، شێت نیی‌و، تۆ پاداشتێکی نەبڕاوەت هەیەو، تۆ لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی، دوایی تۆش دەبینی‌و ئەوانیش دەبینن، کامەتان شێتن.**

خوای پەروەردگار، چەند بەبێ باكیی، وا دەفەرمویٚ! ئـەو شـتانە زۆر جێی سەرەنجن‌و، ئیعجازی مێژوویین.

هەروەها لە سـوورەتی (ص)دا، دەفـەرمویٚ: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: بلێ: هیچ كرێتان لەسەری لێ داواناكەم‌و مـن لـە بارگرانكـەران نیم،ئـەم قورئانـە، یـاد خەرەوەیـە، بـۆ هـەموو جیهانییان، دوای ماوەیەكی دیكەش، هەواڵەكەی دەزانن.

چونكە خوا زانیویەتی، ئیسلام، چی لێدیٚ‌و چـۆن دەبـیٚ! كاتێـك ئـەو ئایەتـە دابـەزیوە، قۆنـاغی مەككـە بـووە، پێغەمبـەر ﷺ، چەوسـێنراوەتەوە، هاوەڵـەكان، ئـازادو دراون‌و ئەشـكەنجە دراون، كـەس بـە تـەمای سـەری خـۆی نـەبووە، بـەڵام خـوا دەفـەرمویٚ: پێیـــان بڵـــی: دوای پێچـــێكی دیكـــە، دوای ماوەیـــەكی دیكـــە، هەواڵەكەی دەزانـن، واتـە: ئـەم ئیسـلامە چـۆن دونیـا دادەگـریٚ‌و بڵاودەبێتەوە!

مەبەستمان ئەوەیە:

خـوای پـەروەردگار کـە باسـی ڕەوشـتی مـەزنی پێغەمبـەر ﷺ دەکـات، لـە بەرانبـەر بانگەشـە، پـڕو پاگەنـدەی کافرەکانـدا، کـە دەیانگوت: شێتەو جادووگەرەو پێغەمبەر نیە، دەفەرموێ: تۆ بە هۆی چاکەی پەروەردگارتەوە - کە پلەو پایـەی پێغەمبەرایـەتیی پێداوی - شێت نیو پێغەمبەری. بـە بەڵگـەی ئـەوەی کـە لەسـەر ڕەوشتو ئاکارێکی بەرزو مەزنی.

بەڵێ خوشكو برا عەزیزەکانم!

ئێمـەش باشـترین بەڵگـەی ئیسـپاتکردنی مسوڵمانەتییو ڕاسـتو ساغییمانو لە هەمان کاتیشدا چـاکترینەو کاریگـەرترین شـێوازی بانگەوازیشمان بۆ خەڵك بەرەو ئیسلام ئەوەیە: ڕەوشتمان بەرزو ئاکارمـان پەسـند بـێ، ئـەوە پێـوەرو تەرازووێکـە، زۆر ڕاسـتو دادگەرەو زۆر هەقە، ئایا کێ دەتوانێ هـەتا سـەر ڕەوشـتی بـەرزو پەسند بـێ، وەڵڵاهـی تـەنیا کەسـێك، دڵەکـەی پەیوەسـت بـێ بـە

**خواوه، کەسێك دوا ڕۆژ بەسەر دنیادا هەڵبژێریّو، دنیای لە لا بچووك بیّو، دوا ڕۆژی لەلا مەزن بیّو تەنیا باباى وا دەتوانیّ تا سەر، ڕاستگۆ بیّ، تا سەر ئەمین بیّ، تا سەر پاكو چاك بیّ، تا سەر بە ڕەحم بیّ، دادگەر بیّ ... هتد، بەڵام خەڵكی دیكە، بە ڕواڵەت، لەبەر چاوی خەڵك شتێك دەكاتو، دوایی شتێكی دیكە دەكات!**

**ئنجا با قسەیەكی دایكمان عائیشە، خوا لێی ڕازی بیّ، بێنین كە دەیكەمە كۆتایی قسەكانم:**

**كاتێك پرسیاری لێدەكریّ، دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ، یەكێك پرسیاری لیّ دەكات، گەنجێك دەڵیّ: ئایا ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بووە؟ ئەویش دەڵیّ: ڕۆڵە گیان! قورئانیّ ناخوێنی، دەڵیّ: با، دەڵیّ:** {كَانَ خُلُقُ نَبِيِّ اللهِ ﷺ الْقُرْآن}[٥١]**، واتە: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ، قورئان بوو،**

---

٥١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: ١٣٩.

**یـانی: چـی؟ یـانی: قورئـان چـی دەفـەرموو: پێغەمبـەر ﷺ، وای دەکرد.**

**خوشكو برا بەڕێزو خۆشەویستەكانم!**

**زمانی كردار، فەصیح ترینو گۆیاترین زمانەو، باشترین شـێوازە، ئەگەر دەمانەوێ: خەڵك فێـری دینـداریی بكـەین، بـا بـۆ خۆمـان موتەدیین بین، دەمانەوێ: فێری ڕاسـتگۆییان بكـەین، بـا ڕاسـتگۆ بین، دەمانەوێ: فێری زوهدو قەناعـەتیان بكـەین، دەبـێ خۆمـان وا بـین، دەمانـەوێ: فێـری میهرەبانییـان بكـەین، بـا خۆمـان بـە ڕەحمو میهرەبان بین، دەمانەوێ: فێری خاكیی بوونیـان بكـەین، با خۆمان خاكیی بینو،....هتد.**

**ئەگـەرنا بـا دڵنیـابین نـەدار پێـی نابەخشـرێ، (**فَاقِدُ الشـيءِ لاَ يُعْطِيهِ**)و ئاسانی ساردیش بە فوو گەرم نابێ.**

**خـوا بـە لوتـفو كـەڕەمی خـۆی یارمـەتیمان بـدات، كـە وە ڕازاوە بین، بە ڕەوشتە بەرزو پەسندەكان، بە شـێوەیەك كـە شایستەی،**

ئەوە بین، بڵێین: ئێمەش شوێنکەوتووی پێغەمبەرێکین ﷺ، کە لە لووتکەی هەموو ڕەوشتێکی بەرزو ئاکارێکی جوانو پەسنددا بووە، کە هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆ خۆی باشترین بەڵگەی ڕاستیی ئایینەکەیەتی، هەر کەسێك تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ بکات، ئنجا دەزانێ، کە ئایینو بەرنامەکەی زۆر ڕاستە، چونکە ئەو زاتە لە لووتکەی ڕەوشتی بەرزو ئاکاری پەسەند دایە، کەواتە: دیارە ئایینەکەشی وایە.

خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی ئێمەش وا لێبکات، کە بە کردەوەو حاڵمان مایەی لی لای خەڵك شیرین کردنی ئیسلامو، سەرنج ڕاکێشانیان بین، بە لای خواو پێغەمبەرەکەی (محمد) ﷺ ڕێبازەکەیدا.

## تەوەری هەشتەم

## ئاكارو ڕەوشتە پەسندە بنەڕەتییەكانی بانگەوازكاران

براو خوشكانی بەڕێز!

ئـەم وتـارە هـەمووی بـۆ ئـەم تـەوەرە تـەرخان دەكـەین، لەبـەر ئـەوەی هـەركارێك كـە بـە كەسـێك دەسـپێردرێ، ئـەو كەسـە بـە ئەندازەی ئەوە كە كەفائەتو شایستەیی ئەنجامـدانی ئـەو كـارەی تێدایە، سەركەوتوو دەبێ لە ئەنجامدانی كارەكەیدا، بەڵام ئەگـەر بێتو شایستەیی‌و كەفائەتی نەبێ، كارەكە زایە دەبێ، بۆیە ئێمە پانتاییەكی باشمان تەرخان كردوە بۆ باسكردنی ئاكارو ڕەوشتە پەسندە بنەڕەتییەكانی بانگەوازكاران.

ئێمە لە تەوەرەكانی ڕابردووشدا، كەم‌و زۆر باسی ئـەوەمان كـرد، بە تایبەت لە: (تەوەری حەوتەم: بنەما گرنگـەكانی بانگـەواز)دا، بەڵام ئەوكاتە بە گشتی باسی بنەماكانی كاری بانگـەوازمان كـرد، واتە: چ تاكێك پێی هەڵسێ، چ دامەزراوەیەك پێی هەڵسێ، چ بـە

هەرەوەزیی بێ، بە هەر شێوەیەك بێ، بـەڵام ئـەمجارە باسـی ئـەو تاكانە دەكەین، ئەو كەسانە كە بە كاری بانگەواز هەڵدەستن، ئایا دەبێ خاوەنی چ جۆرە خەصڵەتو سیفەتێكی بـەرزو جـوان بـن؟ مـن بیسـتو پێـنج (٢٥) سـیفەتم باسـكردوون، لـەو سـیفەتو خەصڵەتە بەرزو بنەڕەتیانەی، كە دەبێ بانگەوازكاران خۆیانیـان پـێ بڕازێننـەوە، هەمووشـیان دوو دوو بـە جـووت، بـاس دەكـەم، جگە لە كۆتاییان، كە بیستو پێنجەمین (٢٥)ە.

**١ و ٢ ) ئیمانی مەحكەمو دامەزراوو، پارێزكاریی شایستەو تەواو:**

خـوا سـبحانە وتعـالى لـە سـووڕەتی (یـونس) لـە ئایـەتی: (٦٢) و (٦٣)دا بۆمـان باسـی دۆسـتەكانی خـۆی دەكـات، بـە تەئكیـد بـراو خوشكانی بەڕێز! كەسێك دۆستی خوا نەبێ، هەوڵ نادات دۆستان بـۆ خـوا پەیـدا بكـاتو، كەسـێك لـە خـوا نزیـك نـەبێ، هانـدەرو پاڵنــەرێكی نــابێ، خــەڵك لــە خــوا نزیــك بخاتــەوە، وشــەی (أولیاء)یش، كۆی (ولي)ە، وشەی (ولي) بە شەددە لە ئەسڵدا لە

(وڵي)ەوە هاتوە، یانی: (قرب) نیزیکیی[٥٢]، خوا ئاوا پێناسەی دۆستەکانی خۆی دەکات، دەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾﴾ یونس، واتە: ئاگاداربن! (خوا هۆشداریيمان پێدەدات) دۆستانی خوا نە ترسیان لەسەرە، نە پەژارەش دادەگرن.

(یانی: نەترسیان لەسەرە بۆ داهاتوو، نە خەمو پەژارەش دادەگرن بۆ ڕابردوو) ئایا دۆستانی خوا کێن؟ ئەوانەن کە ئیمانیان هێناوە (بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ)، هەروەها ئەوە سیفەتێکی ڕیشەداریان بوو کە هەمیشە پارێزیان دەکرد، ئیمانەکە بە کرداری ڕابردوو دێنێ، چونکە ئیمان تێپەڕیوە، ئیمانیان هێناوە، بەڵام تەقواکە بە کرداری

٥٢) مفردات ألفاظ القرآن، ص٥٦٦ ـ ٥٦٨، المكتبة العصرية/ ٢٠١٢م.

ئێستا دێنێ، چونکە تەقوا شتێکی بەردەوامەو، دووبارە دەبێتەوە.

خوشك‌و برا بەڕێزەکانم!

یەکەمین سیفەتی ئینسانی بانگەوازکار بۆ لای خوا، ئەوەیە کە (ئیمانێکی مەحکەم‌و دامەزراو)ی هەبێ، ئیمان بە خوای بەرزو مەزن، بە فریشتەکانی خوا، بە کتێبەکانی خوا، وە بە پێغەمبەرانی خوا، وە بە ڕۆژی دوایی، وە بە نەخشەو ئەندازەگیریی خوا سبحانه وتعالى.

ئیمان بناغەیە بۆ هەموو شتەکانی دیکە، بۆیە خوا سبحانه وتعالى سێزدە ساڵی ڕەبەقی تەرخان کردن لە ژیانی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ - کە هەموو ژیانەکەی ژیانی پێغەمبەرایەتی بیست‌و سێ ساڵ بوو -، سێزدە (١٣) ساڵی ڕەبەقی تەرخان کردن بۆ داکوتان‌و سەقامگیر کردنی ئیمان‌و عەقیدە، لە دڵی هاوەڵاندا خوا لێیان ڕازی بێ، ئنجا دوایی دە (١٠) ساڵەکەی دیکە، دوای ئەوەی ئیمانیان پەیدابوو، ئنجا ئەحکامیان بۆ هاتنە خوار، بۆ

**یـەك جـاریش خـوا سـبحانە وتعـالى لـە قورئـانی مەککەییـدا نەیفەرمووە: (**یا أیها الذین امنوا**)، بەڵکو یـان فەرموویـەتی: (**یـا أیها الإنسان**) یان (یـا بنـي ادم) یـان (**یـا أیهـا النـاس**)، بـەڵام لـە قورئانی مەدینەییدا، خوا سبحانە وتعـالى، ئنجا دەسـتی کـرد بـە دوانـدنی ئـەو کۆمەڵـە کـە ئیمانیـان لـە دڵـدا دامـەزراوەو، ئیسـلامییان فێرکـراوەو، شایسـتەیی ئـەوەیان پەیـداکردوە، کـە شـەریعەتی خـوا پیـادە بکـەن، لـە ژیـانی تـاکیی‌و، خێزانیـی‌و، کۆمەڵایەتیی‌و، سیاسیی خۆیاندا.**

**ئنجا دوایی (پارێزکاریی شایستەو تەواو)، دیارە ئیمان‌و تەقوا لـە قورئانـدا، زۆرجـار پێکـەوە هـاتوون، لێـرەدا خـوای تـاك‌و پـاك پێناسـەی دۆسـتان (**أولیـاء**)ی خـۆی کـردوە، هەڵبەتـە دوایـی بـە سیفەتی دیکەش وەسـفیان دەکـات، بـەڵام ئـەم دوو سـیفەتە، دوو سیفەتی بنچینەیین، بـۆ پێناسـەی دۆسـتانی خـوا، بۆیـە زانایـان گوتوویانـە: (**مَـنْ كَـانَ مُؤْمِنَـاً تَقِيَّـاً، كَـانَ لِلهِ وَلِيَّـاً**) واتـە: هـەر کەسێك بڕوادارو پارێزکار بوو، دۆستی خوایە، بەداخەوە لە نێو**

كـوردەواریی خۆمانـدا، زۆرجـار دۆسـتانی خـوا (أولیـاء الله) بـە شـێوەیەك وێنـاكراونو تەصـەووڕكراون، پێچـەوانەی ئـەوە كـە قورئـانو سـوننەت باسـیان دەكـات، لەوانـە: جـاری وا هـەبووە، كەسێك كە ڕەنگە شێت بووبێ، یان عەقڵی تەواو نەبێ، یان گێـل بووبێ، گوتوویانە: ڕەنگە ئەوە دۆسـتی خـوا بـێ! نـا، دۆسـتەكانی خـوا، هـەموویان لـە لووتكـەی عەقڵـدان، هەڵبەتـە هـەموو بەندەكان، بەندەی خوان، بەڵام دۆستەكانی خوا، عـاقڵن، زۆریـش عاقڵن، وە ئـەهلی عـیلمنو، خـاوەن بەصـیرەتنو، بلیمـەتن، بۆیـە ناگونجێ ئینسانی شێت، یـان كەسـێك پـاكو خـاوێنی بـۆ نـەكرێ، ناگونجێ دۆستی خـوا بـێ، ئەمـە وەك ڕاسـتكردنەوەی چـەمكێكی بـاوی نێـو خـەڵك، بـەڵێ دۆسـتەكانی خـوا عـاقڵنو لـە عەقڵـەوە پێچراونو، لە هەموو شتێكدا تێرو تەواون.

**٣ و ٤ )- خوا پەرستیەكی گشتگیرو بەتام، یادی خوا كردنێكــی لــە ناخەوەو بەردەوام:**

بێگومان كەسێك بیـەوێ بانگـەوازكار بـێو، خـەڵك بـۆ لای خـوا بانگ بكات، دەبێ خۆی خواپەرستییەكی هەبێ، كە تامی لێبكات چـێژی لـێ وەربگـرێ، تەماشـای ئـەو فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ρ بكـەین، كـە دەفـەرموێ: {ذَاقَ طَعْمَ الإِيمَـانِ: مَنْ رَضِـيَ بِـاللَّهِ رَبَّاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً, وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً»}[٥٣].

واتــە: تــامی ئیمــانی چـێژتوە هـەر كەسـێك ڕازی بووبـێ خـوا پەوەردگاری بێو، ئیسلام بەرنامەی ژیـانی بـێو، موحەممـەدیش وەك پێغەمبەرو ڕەوانەكراوی خوا قبووڵ بكات.

كەواتــە: ئیمـانیش تـامو چـێژی هەیـە، ئنجـا كەسـێك دەتوانـێ بانگـەوازكار بـێ بـۆ لای خـوا، كـە چـێژ لـە ئیمانەكـەی خـۆی وەربگرێ، تام لە خواپەرستیی بكات، هەڵبەتە هەركەسێكیش تام

---

٥٣) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: ١٧٧٨، وَمُسْلِمٌ برقم: ٣٤، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: ٢٦٢٣، عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ.

له خواپەرستیی بکات، هەمیشە خوای لە یاد دەبێ، بۆیە دوایی گوتوومە: (یادی خوا کردنێکی لە ناخەوەو بەردەوام).

یادی خوا کردنیش، دیسان دەبێ چەمکەکەی ڕوون بکەیەنەوە، زۆر کەس وا دەزانێ یادی خوا کردن، ئەوەیە: کە هەمیشە دەبێ ئینسان ئەو وشانەی کە زیکریان پێ دەگوترێ: (سُبْحَانَ الله، الحَمْدُلله، لا إِلَـه إلاَّ الله، اللهُ أَكْبُـر، أَسْتَغْفِر الله) بەزاری گۆ (تلفظ) بکات، بەڵام مەرج نیە، یادی خوا هەر بەو شێوەیە بێ، ئەصڵی یاد (ذکر) پێچەوانەی لە بیرچوون (نسیان)ە. یادی خوا کردن واتە: خوا، لە یاد بوون ئەصڵەکەی ئەوەیە، ئنجا جاری وا هەیە: وێڕای ئەوەی کە لە دڵو زەینیدا هەیە، بە زمانیش ئەو وشانە دەڵێ، بەڵام ئەسڵی یادی خوا، ئەوەیە کە لە عەقڵو دڵو هۆشدا بێ، ئەگەر ئەوە نەبێت، جووڵەی زمان، هیچ سوودێك بە مرۆڤ ناگەیەنێ، خوای پەروەردگار لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿

ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ

تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا

تَصۡنَعُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾العنكبوت، واته: ئەوەی لە كتێبی پەروەردگارت

بۆت سروش كراوە، بیخوێنەو، نوێژ بەرپا بكە، نوێژ قەدەغەی

خاوەنەكەی دەكات لە هەرچی كردارو قسەو ڕەفتاری دزێو

ناقۆڵاو خراپ هەیەو، یادی خواش گەورەترە، (واتە: یادی خوا

گەورەترە لە نوێژیش یادی خوا گەورەترە لە قورئان

خوێندنیش)و، خوا دەزانێ چی دەكەن!

ئنجا لە ڕاستییدا خوای میهرەبان كتێبو فەرمایشتەكەی

خۆیشی بۆیە ناردوە، كە ئێمە خوامان لەبیربێ، هەروەها

نوێژیش بۆیە فەرز كراوە، كە خوامان لەبیربێ، وەك

فەرموویەتی: ﴿ ...وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ ﴾طه، واتە: نوێژ

بەرپا بكە, بۆ یادكردنی من, قورئانیش بۆیە ناوی لێنراوە

(زیكر)، چونكە خوات بیردەخاتەوە.

بـەڵێ سـیفەتی سـێیەمو چـوارەمی بانگـەوازکاران ئەوەیـە: کـە هـەرکامیان خواپەرسـتییەکی گشـتگیرو بـەتامو چـێژی هـەبێو، یادی خوا کردنێکی لە ناخەوە، لە دڵەوەو، بەردەوامی هەبێ.

**٥ و ٦ )- زانیاریی قــووڵو فــراوان بــە دیـنو، بەرچــاو ڕوونیــیو شارەزایی دەربارەی ژین:**

پێشتریش باسمان کردوون، بە بۆنەی دیکەوەو، هـەر ئـەم ئایەتـە موبارەکـەشمان بەبەڵگـەی هــەردووکیان هێنایــەوە: ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾یوسف.

هەروەها بەبێ زانیاریيو بەرچاو ڕوونیيو شارەزایی، ئینسان بـۆ خۆشی نـازانی بـە ڕێگـادا بـڕوات، چ جـای پـێش خـەڵکی بکـەوێ، هـەروەها بــەبێ شــارەزابوونی وەزعو بــاردۆخو ڕۆژگــار، ئینســان دۆسـتو دوژمـنی لـێ تێکـەڵ دەبـنو، چاكو خراپـی لـێ تێکـەڵ دەبنو، فێڵی لێ دەکرێو، هەڵدەخەڵەتێنرێ، کەواتـە: کەسـانی وا

ناتوانن خەڵك لە خوا نزيك بخەنەوەو، خەڵك وا لێبكەنو، وا داربكەن، كە پابەند بێ بە پەيامو بەرنامەی خوای پەروەردگارەوە.

**٧ و ٨ )- دڵسۆزيی و بە تەنگەوەبوون بۆ هەمووانو، هێمنيی و ئاراميی و نەلەخشان:**

بەڵێ كەسێك دەتوانێ خەڵك لە خوا نزيك بخاتەوەو، بۆ لای خوايان بانگ بكات، كە لە ناخەوە بۆ هەموو لايەك دڵسۆزو، بە تەنگەوە بێ، بێ جياوازيی، ئەمەش زۆرجار جێی تێدا بەهەڵە داچوونە، كەسانێك وا دەزانن كە دەبێ بەس بۆ مسوڵمانان، دڵسۆز بين! بەڵام ئێمە پێغەمبەران دەبينين (عليهم الصَّلاَة والسلام) بە خەڵكە كافرەكەی خۆيانيان گوتوە: ﴿...وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾﴾الأعراف، واتە: من بۆ ئێوە بەتەنگەوەم، دڵسۆزم دڵ سووتاوم بۆ ئێوە، ئەوە دەبێ ئەو چەمكە ڕاست بكرێتەوە، ئنجا لە ڕاستييدا ئەگەر خەڵك نەزانی بۆی دڵسۆزی: نە متمانەت پێدەكات، نە گوێت بۆ دەگرێو، نەقسەشت

**لێوەردەگرێ، ئایا ئێمە ناتوانین دڵسۆزبین بۆ نامسوڵمانان؟ نـەك هەر دەبێ بتـوانین، بـەڵكو ئـەوە ئەركێكـەو فـەرزە، پێغەمبـەران** (عليهم الصَّلاَة والسلام) **وابـوون، پێغەمبـەری خۆمـان (محمـد) ρ، سەروەری هەموو پێغەمبەران، چەند بە شەفەقەتو بەڕەحم بووە؟ با تەماشا بكەین، وە لەوبارەوە، دڵسۆزیی خۆی چۆن وێنـا دەكات لەگەڵ كەسانێكدا كـە دژایەتیشیان كـردوە:** {كَـانَ صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم يَحْكِي نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَـاءِ، ضَـرَبَهُ قَوْمُـهُ فَـأَدْمَوْهُ، وَهُوَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِـهِ وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَـإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ}[٥٤].

**واتـــە: پێغەمبـــەر (محمـــد) ρ باســـی پێغەمبـــەرێكی كـــرد بـــۆ هاوەڵانی، كـە قەومەكـەی بـەردبارانیان دەكـرد خوێنیـان لێهێنـا، (ســـەریان شـــكاندو بـــەدەنییان بـــە خوێنـــدا هێنـــا)، ئـــەویش خوێنەكەی دەسڕیو دەیفـەرموو: خوایـە! لـە گەلەكـەم خۆشـبە، چونكە نازانن، لێیان ببوورە!**

---

٥٤) أَخْرَجَهُ البخاري برقم: ٣٢٩٠. عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ.

مەبەستم ئەوەیە جاری وا کەسێك ملی حەدیسێك دەگرێ، کە ڕەنگە لە سیاقێکی دیکەدا هاتبێ‌و حاڵەتێکی تایبەت بێ، کە دروست نیە ئینسان هیچ شەفەقەت‌و ڕەحم‌و بە تەنگەوە بوون‌و بەزەیی هەبێ بەرانبەر بە غەیری مسوڵمان! بەڵام ئەوە بەڕەهایی وانیە، ئەوەتا ئەو پێغەمبەرانە (علیهم الصَّلاَة والسلام)، کە خوا هەم لە (نوح)ەوە دەیگێڕێتەوە: ﴿وَأَنصَحُ لَكُمۡ ﴿٦٢﴾﴾الأعراف، هەم لە (هود)ەوە دەیگێڕێتەوە: ﴿وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾﴾الأعراف، هەروەها لە صاڵحەوە دەیگێڕێتەوە: ﴿وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ ﴿٧٩﴾﴾الأعراف، هەروەها لە شوعەیبەوە دەیگێڕێتەوە: ﴿وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ ﴿٩٣﴾﴾الأعراف، هەموویان باسی خۆیان بە (ناصح)ی گەلەکەیان ناساندوە، (نصح) یانی چی؟ (النصح: إرادة الخير للمنصوح)[55]، (نُصح) یان (نصیحة)

٥٥) مفردات ألفاظ القرآن: ص٥١٤، المطبعة العصرية، ٢٠١٢ م، {النصح: تحري فعل أو قول فيه صلاح صاحبه}.

بریتیه لەوە ئەو كەسە كە نەصیحەتەكەی ئاڕاستە دەكرێ چی بۆ چاكە ئەوەت بۆی بوێ.

جاری دیكەش باسمان كردوە، زۆركەس وا دەزانێ نەصیحەت یانی: ئامۆژگاریی، چونكە زۆرجار لە كوردیدا نەصیحەت لە جیاتی ئامۆژگاریی (موعظة) بەكاردێنین، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا جیایەو، ئەگەر بڵێین: (نصیحه) یانی: ئامۆژگاریی، مەفهوومی زۆر ئایەتو حەدیسمان لێ تێكدەچن، بۆ وێنە:

پێغەمبەر ρ دەفەرموێ: {«الدِّينُ النَّصِيحَةُ»، قُلْنَا: لِمَنْ؟ قَالَ: «لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ»}[٥٦].

واتە: نەصیحەت ئاڕاستەی پێنج لایەنان دەكرێ: بۆ خوا، بۆ كتێبی خوا، بۆ پێغەمبەری خوا، بۆ پێشەوایانی مسوڵمانو بەرپرسانیانو، بۆ خەڵكەكە بە گشتی.

ئنجا ئەگەر (نصیحة) بە مانای (موعظة) بێ، چۆن ئامۆژگاریی خواو كتێبی خوا دەكرێ؟ نا (نصیحة) ئەوەیە كە: دڵسۆز بی بۆ

---

٥٦) أَخْرَجَهُ أحمد برقم: ١٦٩٨٢، ومسلم برقم: ٥٥، وأبو داود برقم: ٤٩٤٤، عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِي.

خـوا سـاغ بـی لەگـەڵ خـوادا، دڵسـۆزبی بـۆ کتـێبی خـوا، بـۆ پێغەمبـەری خـوا ρ، بـۆ بەرپرسـانو بـۆ خـەڵك بـە گشـتی، دڵسۆزیی‌و بەتەنگەوە بوون بۆ هەمووان.

پاشـان (هێمنیـی‌و ئـارامیی‌و نەلەخشـان)، چـونکە لـە کـاتی شـێنەیی‌و بێگرفتیـی‌و بێکێشـەییدا، هـەموو کـەس ئازایـە، بـەڵام گرنگ ئەوەیە ئایا تۆ لەو نارەحەتییدا لە کاتێکدا کە بـە شـێوەی ناشایست مامەڵەت لەگەڵدا دەکرێ، خـۆڕاگر دەبـی یـان نـا؟ بۆیـە خـوا سـبحانە وتعـالی لـە سـوورەتی (البقـرة)دا (صـبر)مان لـە سـێ حالاَنـــدا بـــۆ دەخاتـــە ڕوو، دەفـــەرموێ: ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ

﴾.

واتە: خۆڕاگران لە کاتی هەژاریی‌و نەداریی‌و بـێ ئیمکانیەتییـدا، هەروەها لە کاتی نەخۆشیی‌و ناخۆشیی‌و، نارەحەتیی‌و، لـە کـاتی جەنگ‌و ڕووبەڕوو بوونەوە، لـەو سـێ حاڵەتانـەدا دەبـێ خـۆڕاگر

بين، بێگومان باباى خەڵك بانگكەر بۆ لاى خوا، وە ئەگەر بۆيان دڵسۆز نەبێو، بە تەنگيانەوە نەبێ, كارەكەى پيتو پێزى نابێو بەرهەمدار نابێ، جارى وايە كەسێك وەك وەزيفە، يان وەك ئەركێكى دنيايى كارەكەى دەكات، هەندێك كەس هەن، كە لە وەزارەتى ئەوقافەوە ڕادەسپێررێنو، ئيشێكيان پێ دەسپێررێ، وەك پيشەيەك، ئەنجامى دەدەن، بەلاَم ئەگەر لە دڵەوە بۆ خەڵكەكە دڵسۆز نەبێت، كاريگەريى نابێ، هەڵبەتە كە بۆشيان دڵسۆز بوو، خۆڕاگريش دەبێ, ئەو سيفەتانە، هەمووتان پێكەوە پەيوەستن، ئينسان ئەگەر بۆ خەڵكەكە دڵسۆز بێت، تەحەمموليشيان دەكات، نەزانيىو نەفامييشيان لێ تەحەممول دەكات، لەبەر ڕازى كردنى خوا.

**٩ و ١٠)- كراوەیی‌و مامەڵەی بەڕێزو سەنگین، ڕووگەشی‌و قسەو گفتو لفتی شیرین:**

خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ:

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ ﴾، واتە: بەندەكانی خوای خاوەن بەبەزەیی، بە هێمنیی‌و بە ئارامیی ڕێگادا دەڕۆن، بە سەنگینیی‌و ویقارەوەو، كاتێك نەفامانیش دەیان دوێنن، قسەی سەلامەت دەكەن، یاخود دەڵێن: سەلامتان لێبێ.

چونكە هەر كەس چی پێبێ، لەوە دەبەخشێ، دەڵێن: جارێك پێغەمبەر عیسا (علیە السلام) بە شوێنێكدا دەڕوات لەگەڵ حەوارییەكانی خوا لێیان ڕازی بێ، خەڵكێكی نەفام، جنێوی پێدەڵێن، یان قسەی ناشایست، ئەویش دەست بەرزدەكاتەوەو، دوعایان بۆ دەكات، حەوارییەكانی پێی دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوانە قسەت پێدەڵێن، جنێوت پێدەڵێن! دەڵێ: دەزانم،

بەڵام هەر كەس چی پێ بێ، لەوە دەبەخشێ، ئەوان جنێویان پێیە، منیش دوعای خێرو قسەی خێرم پێیە.

بەڵێ (كراوەییو مامەڵەی بەڕێزو سەنگین)، خەسڵەتێكی گرنگو بنەڕەتیی بانگەوازكارانە، چونكە: بە گرژییو داخراویی، ئینسان ناتوانێ كارلێك لەگەڵ دەوروبەری خۆیدا بكات، دەبێ كراوە بێ، بەڵام كرانەوە بەبێ توانەوە، كرانەوە، واتە: تۆ داخراو نەبی، بە جۆرێك بوار نەدەی لەگەڵ هیچ كەسدا كارلێك بكەی، لە بەرانبەریش دا: هێندە كراوە بڵاو نەبی، هیچت پێوە بەند نەبیو هیچت پێوە نەمێنێ، چونكە هەندێك كەس بە بیانووی كرانەوە، دەتوێنەوە لە كۆمەڵگادا دەبنە بەشێك لە واقیعێكی خراپ!

ئنجا (ڕووگەشییو قسەو گفتو لفتی شیرین)یش خەسڵەتێكی دیكەی خەڵك بانگكەرانە بۆ لای خوا عز وجل.

براو خوشكە خۆشەویستەكانم!

دڵسۆزانە ئامۆژگارییتان دەکەم هەمیشەو تاکو بۆتان دەکرێ: با لەگەڵ خەڵك دا، قسەو گفتو لفتتان شیرین بێ، ڕووتان خۆش‌و گەش بێ، بڕواتان بێ، زۆر کەس کە تەماشای ئێمەو مانان دەکات، ئێمە چۆن ببینێ، دینەکەشمان وا دەبینێ، بۆیە خوا سبحانە وتعالی کە پێغەمبەرانی (علیهم الصَّلاَة والسلام) ناردوون، لە هەموو ڕوویێکەوە، لە خەڵکی ڕۆژگاری خۆیان تەواوتر بوون، لە ڕووی جەستەیی‌و ڕووحیی‌و عەقڵیی‌و دەروونیی‌و ئاکاریی‌و لە هەموو ڕوویێکەوە، بۆ ئەوەی هەر کەسێك ئەوانی بینی، دیمەنیانی بینی، هەڵسوکەوتیانی بینی، ئەخلاقیانی بینی، سیفەتە بەرزەکانیانی بینی: تێرو تەواویی پەیام‌و دینەکەیان، لە تێرو تەواویی ئەواندا ببینێ، ئێمە دەبێ وریا بین! ئەم دینە ئەگەر بە ڕووخۆشیی خەڵکی بۆ بانگ نەکرێ، بە گرژیی‌و مۆن‌و مرچیی خەڵکی بۆ بانگ ناکرێ، ئەگەر بە قسەی خۆش‌و گفتو لفتی شیرین، خەڵکی بۆ ڕانەکێشرێ، بە تەئکید بە توانج‌و پلارو قسەی زبرو ناخۆش،

خەڵکی بۆ بانگ ناکرێ، خوای تاكو پاك بە پێغەمبەری خاتەم ρ دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾، واتە: تۆ بە هۆی بەزەیی خواوە، بۆیان نەرم بووی، ئەگەر قسە ڕەقو دڵ ڕەق بووای، لە دەورت دەپڕژان...، کێ لە دەوری کێ دەپڕژا؟ ئەو هاوەڵە بەڕێزانە، کە باشترین مرۆڤن لە دوای پێغەمبەران، لە دەوری پێغەمبەر (محمد) ρ کە (رحمة للعالمین)ە، دەپڕژان، ئەگەر قسە ڕەقو دڵ ڕەق بووایە.

ئنجا لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (١٩٩)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ ﴾، ئیمام جەعفەری صادیق ڕەحمەتی خوای لێبێ، گوتوویەتی: ئەم ئایەتە ڕیشەو بنکی هەموو ڕەوشتە بەرزەکانی لە خۆیدا کۆکردوونەوە:

**١)- (خُذِ ٱلۡعَفۡوَ) ئـەوەی کـە ئاسـانە، ئاسـان بـە دەسـتەوە دێ، لـە خەڵك وەری بگرە، واتە: چاوەڕوانیی زۆرت لە خەڵکی نـەبێ، بـە زۆریـی ئەوانـەی هەمیشـە پرتـەو بۆڵەیانـەو گلـەیی لـە خـەڵك دەکەن، لەبەر ئەوە لە چاوەڕوانیی زۆریان لێیـان هەیـە، کەواتـە: چـاوەڕوانیی زۆرت لــە خــەڵکی نــەبێو، ئــەوەی بــە ســێنایی بەدەستەوە دێ تەنیا ئەوەیان لێ چاوەڕوان بکە.**

**٢)- (وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ) واتە: بۆ خۆت چاکە بکەو، فەرمانیشی پێبکـە، هەرچی پەسندو چاکە بیکە پیشەی خۆتو فەرمایشتی پێ بکە.**

**٣)- (وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ) کەسێکیش کە نـەفام بـوو، ڕووی لـێ وەرگێڕەو پشتی تێبکەو وازی لێ بێنە.**

**ئیمـام شـافیعی خـوای لێـی ڕازی بـێ، چـەند جـوان دەڵـێ، لـە شیعرێکیدا:**

{لَوْ كُلُّ كَلْبٍ عَوَى أَلْقَمْتُـهُ حَجَرَاً ... لأصبَحَ الصَّخر مِثْقَـالاً بدينَارٍ}

**٨)- كات بەفیڕۆدان بە قسەو باسی پووچ:**

خەسارو حەیفە بۆ هەموو کەس، کاتی خۆی بە فیڕۆ بدات، بەڵام بە تایبەتی بۆ کەسانێك، کە دەیانەوێ خەڵك بەرەو خوا بێنن، بە تەئکید دەبێ زیاتر خۆیان لە قسەی پووچو ڕەفتاری پووچ بپارێزن، خوای کار بەجێش لە پێناسەی بڕواداران دا فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ٣﴾المؤمنون. واتە: (هەروەها ئەو بڕوادارانە سەرفرازن) کە واز لە قسەو ڕەفتاری پووچو بێ کەڵك دێنن.

**٩)- بەکارنەهێنانی شێوازو ئامرازی نوێو هاوچەرخ:**

ئەمیش بۆ بەشێك بە بانگەوازکاران یەکی دیکەیە لە نەخۆشییەکان، یەکی دیکەیە لە کەمو کوڕییەکان،

هەنـــدێك كـــەس ناتوانـــێ خـــۆی بگـــۆڕێ، زۆر جـــار گوتوومـــە: پێشـــینانی خۆمـــان دەڵـــێن: (مـــار هـــەموو ســـاڵێك كیفێـــك دەگـــۆڕێ)، دەڵـــێن: مـــار هـــەموو ســـاڵێك كاژێـــك فـــڕێ دەدا، ئینسـان گـا نیـە لـە كـەوڵێك دوورا بـێ، دەبـێ جار جار چاو بـە شـتەكانی خۆیـدا بگێڕێتـەوە، مـرۆڤ نابـێ دەمـارگیر بـێ بـۆ هـیچ شـتێك،(لە ڕووی بـیروڕاو فیكـرەوە) جگـە لـە وەحیـی، بـــەس ئـــەوەی خـــوا فەرموویـــەتی، یـــان پێغەمبـــەر ρ، فەرموویـــەتی، یـــان كردوویـــەتی، یـــان دانـــی پێهێنـــاوە، ئـــەوە هـەقی ڕەهایـە، ئـەوی دیكـە بـا ئینسـان، هـەموو شـتێك بـە چـاوێك تەماشـا بكـات، بتوانـێ هەڵیسـەنگێنێ، یـانی: تەماشـا بكـەن! پێغەمبـــەر ρ، لـــە مەســـەلەی نـــرخ لەســـەر شـــت دانانـدا، نـرخـی لەسـەر شـت دانـەنا، گوتیـان: {يَـا رَسُـول الله ρ أَلا تُسَـعِّرْ لَنَـا؟ قَـالَ: لاَ أُسَـعِّر إِنَّ المُسَـعِّرَ هُـوَ الله}، واتـە: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ρ ! نرخمـان لەسـەر شـتان بـۆ دانانێی؟! فەرمووی: نـرخ دانانێم، نـرخ دانەر بەس خوایە.

كەچـى دووەم خەليفـەى پێغەمبـەر: عومـەڕ خـوا لێـى ڕازى بێ لە ڕۆژگارى خۆيدا، نرخى لەسەر شت دانا.

ئنجـا ئيمـام ماليـك، ئيمـامى ئـەهلى مەدينـە، دەڵـێ: پێغەمبـەر ρ، لـە ڕۆژگـارى خۆيـدا ئـەوەى كـرد، كـە بـۆ ڕۆژگـارى ئـەو بـاش بـوو، عومـەريش خـوا لێـى ڕازى بـێ، ئەوەى كرد، كە بۆ ڕۆژگارى ئەو باش بوو.

لـە ڕۆژگـارى پێغەمبـەردا ρ، بازرگانـەكان بـە ئينصـاف بـوونو نرخـى زيادیـان لەسـەر شـت دانـەدەنا، بـە نرخـى خـۆى دەيانفرۆشـت، قـۆڵى خـەڵكيان نـەدەبڕى، بـەڵام لـە سـەردەمى حـوكمڕانيى عومـەردا خـوا لێـى ڕازى بـێ، بازرگـانى فێڵبـازو ساختەچـيىو قـۆڵبڕ پەيـدابوون، بۆيـە دەسـتەڵاتى شـەرعيى بـە چـاكى زانـى، نـرخ لەسـەر شـتەكان دابنێ، بۆ ئەوەى قۆڵى خەڵك نەبڕدرێ!

مەبەستم ئەوەیە تۆ نابێ هەر لە کەولێکدا دابی، بەس بەشێوەیەك بیر بکەیەوە، بەڵکو کە دنیا دەگۆڕێ، دەبێ تۆش خۆت بگۆڕی، شێوەی مامەڵەت لەگەڵ دنیادا بگۆڕی، موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانیی، لەگەڵ ئەبوو یوسوف، دوو قوتابی بەرجەستەی ئەبوو حەنیفەن، هەندێك لە زانایان دەڵێن: لە یەك لەسەر سێی مەزهەبەکەیدا، ڕەئیان لەگەڵ وی جیابووە، ئنجا بۆ هۆکاری ڕاجیاییەکەیان دەڵێن: (كَانَ إِخْتِلاَفَ وَقْتٍ وَزَمَانٍ، وَلَيْسَ اخْتِلاَفَ حُجَّةٍ وَبُرْهَان).

واتە: ڕۆژگارەکە لە سەردەمی ئەبو یوسوف و موحەممەددا، گۆڕا، لەگەڵ هی سەردەمی ئیمام ئەبوو حەنیفە, بۆیە ئەوانیش هەندێك لە فەتواکانیان گۆڕی، فەتوا، ئەگەر نا، حوکمی شەرعیی لە جێی خۆیەتی، بەڵام فەتوا دەگۆڕدرێ.

پێشـــتریش ئـــەم ئایەتـــە موبارەکـــەمان خوێنـــدەوە، کـــە دەفـــــــــــەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡ ﴿٤﴾ ﴾إبـــراهيم، واتـــە: هـــیچ پێغەمبـــەرێکمان نـــەناردوە، مەگـــەر بـــە زمـــانی خەڵکەکـــەی، تـــاکو بۆیـــان ڕوون بکاتـــەوە، بێگومـــان زمـــان تـــەنیا مەبەســـت پێـــی (لُغَـــة) نیـــە، بـــەڵکو یـــانی: بـــە شـــێوازی پەســـند لـــە لای وان، بـــە ئامرازەکـــانی ڕۆژگـــاری ئـــەوان، بـــەو شـــێوەیەی کـــە ئـــەوان چـــاکتر لێـــی تێدەگەن، بەو شێوە بیاندوێنێ.

<u>١٠)- نەشـــــارەزایی لـــــە چـــــاك خوێندنـــــەوەی قورئـــــانو، کۆڵەواریی لە زانستە شەرعییەکاندا:</u>

بـــە دڵنیـــایی شـــتێکی زۆر نارێکـــە، بـــۆ کەســـێك بـــانگی خـــەڵك بکـــات بـــۆ لای خـــوا، بـــەڵام نـــەتوانێ فەرمایشـــتەکەی خـــوا، بـــە ڕێکیـــــی بخوێنێتـــــەوە، هـــــەروەها شـــــارەزای زانســـــتە

شــەرعییەكان نــەبێ، ئنجـا ئەگــەر قورئــانو، تەفسـیرە، ئەگــەر فەرمایشــتی پێغەمبــەرە ρ، ئەگــەر ئوصــوولی فیقهــە، فیقهــە، دەبــێ ســەرەدەرێكیان لــێ بكــات، خــوای زانــاو كــارزانیش بــە پێغەمبـــەری كۆتـــایی (محمـــد ρ)ی فـــەرمووە: ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي... (١٠٨) ﴾يوســف، كــە پێشــتریش چــەند جارێــك ئــەو ئایەتە بە پێزەمان هێناوەو قسەشمان لەسەر كردوە.

**١١)- گرنگیـــیو بایــەخیی پێویســـت نـــەدان بـــە مزگـــەوتو دەرسو دەورو وتـــارو، قـــەدر نـــەزانینی پێشـــەوایەتیی (إمامة):**

ئــەوە كــە كەســێك خــەڵك بــۆ لای خــوا بــانگ دەكــات، چ مــەقامو چ پایــەكی هەیــە، ئینســان دەبــێ قــەدری ئــەوە بزانــێ،

خـــوای پـــەروەردگار وەســـفی (عِبـــاد الـــرحْمن) دەكـــات:

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا ﴿٦٣﴾ ﴾،

واتـــە: بەنـــدەكانی (خـــوای) بـــە بـــەزەیی ئەوانـــەن كـــە بـــە هێنمـــی بـــە زەویـــدا دەڕۆنو ... هتـــد، دواتـــر دەفـــەرموێ:

﴿ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾الفرقـــــــــــان، واتـــــــــە: وە بمـــانگێڕە بـــە پێشـــەوا بـــۆ پارێزكـــاران. بێگومـــان مەبەســـتی، تـــەنها ئیمامـــەتی نوێـــژ نیـــە، بـــەڵام ئیمامـــەتیی نوێـــژیش، بەشـــێكە لـــەو ئیمامـــەتو پێشـــەوایەتییەی كـــە (عِبـــاد الرحْمن) داوا لە خوا دەكەن پێیان ببەخشێ.

**١٢)- بـــێ هەڵوێســـتیی لـــە بەرانبـــەر تـــەوژمو كـــارو پـــڕۆژەی ئیسلامیی‌و، پاكسازیی‌و چاكسازیی تێدا كردنی كۆمەڵگادا:**

ئایـا دەگونجـێ كەسـێك خـەڵك بـۆ لای خـوا بـانگ بكـات، بـەڵام بەرانبـــەر بـــە پشـــتگیری كردنـــی تـــەوژمی ئیســـلامیی بـــێ

هەڵوێست بێ، یان بەرانبەر بە كۆمەڵگا بێ هەڵوێست بێ، كە حوكمی چ پادشایەكەو كێ چی دەكاتو كێ چی ناكات؟ خـواى كاربـەجێو زانـا دەفـەموێ: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾آل عمـران، واتـە: بـا كۆمـەڵێكتان هـەبن، بانگـەواز بكـەن بـۆ چـاكەو فـەرمان بـە پەسـند بكـەنو، ڕێگریـی لـە ناپەسـند بكـەنو، هـەر ئەوانـەش سەرفرازن.

**١٣)- نەشـارەزایی لـە زانسـتەكانی ڕۆژگـارو، بێئاگـایی لـە تەوژمە فیكرییو سیاسییەكان:**

ئـەمیش دیسـان كـەمو كـوڕییو نەخۆشـییەكی خراپـە، كـاتی خـۆی زانایـانی ئێمـە، پێشـەوایانی ئێمـە، هـەموو ئەوانـەی كـە

توانیویانـــــە، کاریگــــەرییان هــــەبێ لەســــەر دەوروبــــەرو کۆمــــەڵگای خۆیــــان، بــــۆ نموونــــە: وەك ئــــەبو لحەســــەنی ئەشــــعەریی، ئــــەبو حامیــــدی غــــەززالیی، ئیبنــــو تەیمییــــە، ئیبنــــو لقــــەییم، ئیبنــــو لجــــەوزیی‌و، ئــــەوانی دیکــــەش هــەموویان فیکــرو کلتــوورو فەرهــەنگی ڕۆژگــاری خۆیانیــان، بــاش دەرك‌و هــەزم کــردوە، ئەگــەر تەماشــای کتێبــەکانیان بکــەین زۆر چــاك دەزانــین، توانیویانــە بچــنە قــووڵایی‌و، بــنج‌و بنــاوانی هــەموو ئــەو فیکــرو فەرهــەنگ‌و کلتــووروح تەوژمــە فیکریــی‌و سیاســییانەی، لــە ڕۆژگــاری خۆیانــدا بــوون‌و، توانیویانــە بــەر پەرچیان بدەنــەوەو، ئیسلامیش بــە هێــزو پێــزەوە بخەنــە ڕوو، ئــا ئەوانــە توانیویانــە کاریگەرییان بێ.

**١٤)- بێلایەنیی لە نێوان تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانییداو، بگرە (بۆ هەندێکیان) لایەنگریی کردنی تەوژمی عەلمانیی:**

هەندێك لەوانەی بە حیساب لەسەر بانگ کردنی خەڵك، بۆ لای خوا حیسابن، خۆیان بێ لایەن (محاید) پێشیان دەدەن، تاکو تۆمەتبار نەکرێن بە ئیسلامیی!! ناگونجێ تۆ بێلایەن بی لە نێوانی تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانییدا:

ڕۆژێك، مامۆستایەك کە لە شوێنێك مەلا بوو، لە مزگەوتەکەی خۆی دەریان کردبوو، هات بۆ لام، زۆر خۆی پێ مەزڵووم بوو، گوتم: چییە مامۆستا؟

گوتی: مامۆستا! دەریان کردووم لە مزگەوتەکەم.

گوتم: کەفارەتە (إن شاء الله)، قەیناکا، ئەو شتانەش هەر دەبن.

**گوتی: ئاخر ماموٚستا! دەزانی چیم زوٚر پێناخوٚشە؟**

**گوتم: چی؟**

**گوتی: توٚمەتباریان کردووم, گوتوویانە: توٚ ئیسلامیی!**

**منیش دەستم لە شانو پشتیداو، گوتم: کاکە مەلا! مەلا هەر دەبێ ئیسلامیی بێ، خوٚ نابێ شتێکی دیکە بێ! ئەویش هەندێ فکری لێکردەوەو, گوتی: ڕاستە، بەڵام مەبەستم ئەوە بوو، کە لە حیزبێك دانیم!**

**گوتم: قەیناکا لە هیچ حیزبان دانی، بەڵام هەر دەبێ ئیسلامیی بیو، هەر لەگەڵ ئیسلام بی، چونکە ئەوەی لەگەڵ ئیسلام دا نەبێ، لەگەڵ کوفر دایە، لەگەڵ غەیری ئیسلام دایە.**

**خوای تاكو پاكیش ئەوەی زوٚرجوان ڕوونکردوٚتەوە کە فەرموویەتی:** ﴿ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ

كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ ﴾ص،

**واتـــه: ئايـــا ئەوانـــەی ئیمانیـــان هەیـــەو، کـــردەوە باشـــەکانیان ئـــەنجام داون، وەك خراپـــەکاران‌و تێکـــدەران لـــە زەوی دا تەماشـــایان دەکـــەین؟ یـــاخود ئایـــا پارێزکـــاران، وەك تاوانبـــاران دادەنـــێین؟! ئـــەم قســـەیەم بـــۆ ئـــەو کەســـانەیە، کـــە لـــە بـــەرگی مەلایـــەتیی‌و دینـــداریی دان، کەچـــی لەگـــەڵ حیزبێکـــی عـــەلمانیی دان، ئنجـــا هەشـــیانە دەڵـــێ: فـــەرقیان چـــییە، حیـــزب هـــەر حیزبـــە؟! چـــۆن فـــەرقیان چـــییە، نوێژکـــەرو نوێـــژ نەکـــەر فـــەرقیان زۆرە، کـــاتی خـــۆی شـــەڕو ڕووبـــەڕوو بوونـــەوەمان بـــوو لەگـــەڵ هەنـــدێك لـــەو حیزبانـــەدا، دوایـــی هـــەموو شـــتێ بڕابـــۆوە، یـــەکێك لـــەو بەرپرســـانەی ئەوســـاکە دەعـــوەتی کردبووین، گوتی: مامۆستا! فەرقێکی وامان نەبوو.**

**گوتم: چۆن فەرقمان نەبوو؟**

گوتی: ئاخر كوا ڕاسته گوتبووتان: ئەوانە هەموویان نامسوڵمانن؟!

گوتم: ئەگەر وامان گوتبێ، ئەوەش زێدەڕۆیی بووە، بەڵام بە خوا فەرقمان هەبوو.

گوتی: فەرقمان چی بوو؟

گوتم: ئاخر بە لای كەمەوە ئێمە نوێژكەرو ئێوەش نوێژنەكەر بوون!

گوتی: ئەوەیان ڕاستە، هەرچەندە من خۆم نوێژم دەكرد، بەڵام نوێژكەرمان دەگمەنو یەكجار كەم بوون!

بەڵێ بە حەقیقەت، هەندێ كەس هەر لە خۆی تێكدەدا، دەڵێ: حیزبەكان وەك یەكنو هیچ فەرقیان نیە!

ئاخر چۆن فەرقمان نیە؟ بەس لەبەر ئەوەی هەموویان ناویان حیزبە وەك یەكن؟! تۆ دەبێ تەماشای

بەرنامەکـــەیان‌و کـــارو کـــردەوەو پـــەرێزو بەرهـــەمیان‌و نێوەڕۆکیـــان بکـــەی، چـــونکە ئەصـــڵی حیـــزب بـــوون، غەڵـــەت نیـــە، پەســـندو بگـــرە پێویســـتە، کۆبوونـــەوە لەســـەر بـــاطیـــڵ‌و ستەم‌و گونـــاه غەڵەتـــە، ئەگـــەرنا ئەگـــەر لەســـەر چاکەو هـــەق کۆبیـــەوە، خـــوای پـــەوەردگار باســـی (حِـــزْبُ اللهِ)ی کـــردوە، باســـی (حِـــزْبُ الشـــيطان)یشـــی کـــردوە، ئنجـــا هـــەر کـــەس لەســـەر فیکـــرەی شـــەیتانیی کۆبێتـــەوە، خراپـــە، بـــەڵام کەسێك لەســـەر بەرنامـــەی خـــوا کۆبێتـــەوە، ئـــەوە شـــتێکی پەســـندەو جێی ستایشە.

**١٥)- نـــەبوونی هاوکـــاریی‌و تـــەبایی‌و ڕاوێـــژ بـــە یەکـــدی کـــردن، چ جای یەك بەرنامەیی‌و پێکەوە کارکردن‌و ... هتد:**

ئـــەوەش بێگومـــان ناتـــەواویی‌و نەخۆشـــیەکی گەورەیـــە، کـــە لـــە نێـــو تـــەوژمی بانگەوازکارانـــدا هەیـــە، لـــە حاڵێـــك دا کـــە خـــوا

بــه ئــەهلی ئیمــان بــه گشــتیی دەفــەرموێ: ﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ

بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ ﴿١٠٣﴾ ﴾آل عمـــــران، واتـــــه: تێکـــــڕاو

وێکڕا دەست به ڕێسمانی خواوه بگرن‌و پەرتەوازه مەبن.

﴿ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ ﴿٤٦﴾ ﴾الأنفـــــــال، واتـــــــه:

پێکــەوه نــاکۆك مــەبن، ئەگــەر بێهێــز دەبــن‌و فەشــەل دێــنن‌و

هێزو پێزتان نامێنێ.

کەچـی تــەنیا زانــاو مشــوور خۆرەکانیشــیان پێکــەوه تــەباو

هاوکــار نــەبن!! هاوکــاریی نــەبێ، مــن زۆر خەفــەت لــەوه

دەخــۆم کــه: بــه دڵنیــایی ئــەم کــاری هــەرەوەزیی‌و حیزبییــه،

هەنــدێك جــار مســوڵمانان لــه یــەك دادەبــڕێ! بــەبێ ڕێــك‌و

پێکیــی (تنظــیم)، کــاری جیــددیی نــاکرێ‌و، واقیــع نــاگۆڕدرێ،

ئــەوه شــتێکه هــیچ بــەدیلمان بــۆی نیــه، بــەڵام دەبــێ وریــاش

بــین‌و ئــەو کــاری بــه کۆمــەڵ‌و کــاری حیزبییــه، دامــان نــەبڕێ

چ لــه نێــو خۆمــان دا، چ لــه خــەڵك، ئێمــه دەبــێ بــزانین چــی

دەكــەینو؟ چــۆن دەكــەین؟ زۆرجــاران وام دێتــە بەرچــاو كــە: ئەگــەر ئاگامــان لــە خۆمــان نــەبێ، لــە كۆمــەڵگاو خــەڵك دادەبــڕێینو دەبینــە بژاردەیــەكو لــە بازنەیــەكی تەســكو قــەتیس دەبــین! ئــەوەش نەخۆشــییەكە دەبــێ بــە جیــددی چارەسەر بكرێ.

**١٦)- گیرۆدەبــوون بــە نەخۆشــیی لاســەنگییەوەو، گــەورە كردنی شتی بچووكو بچووكردنەوەی شتی گەورە:**

بۆ وێنە:

١)- ڕیــش، هێشــتنەوە، مــن ڕیــش هێشــتنەوە بــە ســوننەت دەزانم.

٢)- دەلیــنگ هەڵپێچــان (تشــمیر الثــوب)، مــن پــێم چــاك نیــە، كــەس دەلینگــی لــە عــەرزی بخشــێ، بــەڵام فەرموودەكــە باســی

ئــەوە دەكــات كــە كــاتى خــۆى هەنــدێك كــەس بــە فيــزو كەشــخە عــەبايان لــە زەوى خشــاوەو، بێگومــان پێغەمبــەر ρ، پێــى نــاخۆش بــووەو هەڕەشــەى لــەو جــۆرە كەســانە كردوە[٦٥]!

٣)- پێچــە گرتنــەوە (إنتقــاب) ئافرەتــان ئەگــەر بــە چــاكى بــزانن‌و پێچــە بكــەن شــتێكى باشــە، بــەڵام ئەگــەر نەشــيكەن، پێوەى مولزەم نين.

٤)- وێنەگرتن (تصوير) ئنجا كەسێك:

١- مەسەلەى ڕيش هەبوون.

٢- پێچەگرتنەوەى ئافرەتان.

٣- پۆشاك شۆڕكردنەوە.

---

٦٥) مەبەست لەم فەرموودەيە: {عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم، قَالَ: لاَ يَنْظُرُ اللهُ إِلَى مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ} أخرجه مالك برقم: ١٦٣٠، والبخاري برقم: ٥٤٤٦، ومسلم برقم: ٢٠٨٥.

٤- وێنە گرتن، ئەوانە لە خەڵك بكات بە شتی زۆر گەورە، بەڵام لە بەرانبەردا نەپرسێ: ئەرێ ئەم وڵاتە چۆن بەڕێوە دەچێ؟ سیستمی حوكمڕانییەكەی چۆنە؟ ئەرێ ئێمە لە ڕووی ئیدارەدانی وڵاتەوە: لە كوێی فەرمایشتی خوا: ﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ٣٨﴾ الشورى داین؟ ئایا بارودۆخی ئابوورییمان، لە كوێی ئەم ئایەتەی خوایە، كە دەفەرموێ: ﴿كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡ ٧﴾ الحشر، واتە: با سەروەتو سامان لە دەستی دەوڵەمەندەكاندا كورت هەڵنەیەت؟ چ جای لە دەستیماڵێكو بنەماڵەیەكدا؟!

تۆی زاناو مامۆستا! نابێ پرسیار لەوەش بكەی؟ تۆ كە لە حوكمی موو هەڵكێشان (نتف الشعر) دەپێچیەوە؟ ئەدی بۆچی لە حوكمی مل هەڵكێشان ناپێچیەوە؟!

لە حوكمی خاڵ كوتان (وشم) دەپێچیەوە؟ ئەدی بۆچی لە حوكمی خەڵك كوتانێ ناپێچیەوە؟

بەڵێ لە لایەن هەندێك كەس و نێوەندو دەوڵەتەوە، زۆر جار شتی بچووك زۆر گەورە دەكرێ، بە ناوی دینەوەو، شتی زۆر گەورەش زۆر بچووك دەكرێتەوە، یان هەر نادیدە دەگیرێ، كە بە حەقیقەت ئەوەش نەخۆشییەكی كوشندەیە، تووشی هەندێك لە ئەهلی عیلم و بانگەوازكاران بووەو دەبێ.

<u>١٧)- قسەكردنی گشتیی بەبێ دیاریكردنی بە ئامانج گیراوان و، كات و شوێن، بە جۆرێك كە كەس نەزانێ ڕووی دواندن لە كێیە؟:</u>

واتە: نوختە نەخرێتە سەر پیت، هەندێك كەس هەر بە گشتی قسە دەكات، دەبێ وابێ و، نابێ وابێ!، بەڵام تۆ بڵێ:

ڕووی قسەت لە کێیە؟ لەگەڵ سعودیەتە؟ لەگەڵ میصرتە؟ لەگەڵ عێراقتە؟ لەگەڵ ئێرانتە؟ لەگەڵ چ قەومێکتە؟ لە چ کاتێ؟ لە چ شوێنێ؟، دەبێ دیاریی بکرێ، ئنجا خەڵك سوودی لێ دەبینێو لێی تێدەگات.

**١٨)- بە پێی میزاجو طەبع خستنە ڕووی ئیسلام، نەك بە گوێرەی تەرازووی شەرعو پێویستیی خەڵكو جەماوەر:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَ ﴿١٠٥﴾﴾الإسراء، واتە: قورئانمان بە حەق دابەزاندووەو، کە داشبەزیوە هەقی تێدایە، یانی: قورئان هەم بۆ خۆی هەقە، هەم شێوەی دابەزاندنەکەی هەقە، هەر ئایەتەی، هەر سوورەتەی، لە کاتی خۆیو، لە شوێنی خۆیدا دابەزیوە، ئێمەش دەبێ وا بکەین، نەك بە میزاجو طەبعی خۆمان، باسی ئیسلام بکەین، دەبێ بزانین داخۆ: ئایینی خوا

چەندەی گرنگیی بە چی داوە؟ ئێمەش ئەوەندە گرنگیی پێبدەین، کەمتر، کەمترو، زیاتر، زیاتر.

**١٩)- دووچاربوونی زێدەڕۆیی (إفراط)و کەم تەرخەمی (تفریط) وەك: زۆر ڕەشبینیی‌و ترساندن‌و نائومێد کردنی خەڵك لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە: زۆر شلکردنەوەی دینداریی‌و دڵنیاکردنەوەی خەڵك‌و، بێ باك کردنیان:**

هەرگیز لە یادم ناچێ، لە یاداشتەکانیشدا ڕەنگە نووسیبم[٦٦]، لە مزگەوتێك بووم لەم شارە[٦٧]، کاتی خۆی، لە پەیمانگای ئیسلامی بووم، مامۆستایەك وتاری دەدا بۆ خەڵکەکە، گوتی: خەڵکینە! - خەڵکەکەش وەنەبێ زۆر

٦٦) چەند مەلۆیەك لە خەرمانی تەمەنم: ١٩٦١ز- ١٩٩١ز.

٦٧) مەبەست شاری سلێمانیی یە، چونکە ئەو وتارانە لەوێ لە هۆڵێك دا پێشکەش کراوان.

بــەدینو تــەقوا بــووبن - ئێــوە خەریکــە خۆتــان بفــەوتێنن! بــەڵام ئــەو دینــداریی‌و مســوڵمانەتیی‌و چــوونە بەهەشــتە، هێنــدە زەحمــەت نیــە، بــێ قــەزابن، شــتەکە هێنــدە قــورس نیــەو زۆر ئاســانە وەك ئــاو خواردنــەوە وایــە! منــیش تــازە دەگەیشــتمێ، مامۆســتام بــردە ئــەولاوەو، گــوتم: جــەنابی مامۆســتا؟ ئــەو وتــارەی تــۆ بــۆ قەومێکــە، ســووتابن بــە شــــەونوێژو ڕۆژوو عیبــــادەت‌و، هــــەموو پەراســــوویان وەدەرکــەوتبن، ئــەو خەڵکــەی ئــەوە نــین، ئــاوا بۆیــان شــل بکەیــەوە، کــە پێیــان وابــێ کــە زۆریــش بــە زیادییــەوە دینداریيان کردوە! بەڵام کەم‌و کورییان زۆرن!

گوتی: بەڵێ ڕاست دەکەی، ڕەنگە تۆزێ تێم پەڕاندبێ!

بێگومــان ســنووری میــانجی گــرتن (التوسُّـط) زۆر چــاکە، لــە هەموو شتێکدا.

**٢٠)- قسەی باش‌و كردەوەی خراپ، یان ڕواڵەت جوانی نێوەڕۆك وێران:**

ئەمیش نەخۆشییەكی زۆر كوشندەیە، كە تووشی بەشێك لە بانگەوازكاران بووە، خوای بەخشەر پەنامان بدات، كە خۆمان گیرۆدەی ئەو گوناهە زلە:

(قسەی بێ كردەوە) بكەین، خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ ﴾

الصف.

**٢١)- زۆر دەنــــگ هـــەڵێنانو هـــاتو هـــاوار كـــردنو، خـــۆ تـــووڕەكردنو، خـــۆ تـــرشو تـــاڵكردن لـــە كـــاتی وتـــاردانو قسەكردن دا، بە تایبەت لە وتاری جومعەدا:**

**ئـــەمیش نەخۆشـــییەكی دیكـــەی ژمارەیـــەك لـــە وتـــار بێـــژو بانگەوازكارانـــە كـــە هـــەتا تینیـــان تێدایـــە دەنـــگ هەڵـــدەبڕنو, هـــاوار دەكـــەنو، بـــە زۆریـــش وایـــە لـــە قســـەو وتاررەكانیـــان دا: لای ســـــەختگیریو هەڕەشـــــەو ترســـــاندنو باســـــی ســـــزاو جەزرەبەی خوا لە دنیاو دوارۆژدا دەگرن!**

**بـــەلاَم خـــوای كاربـــەجێ ئـــاوا ڕێنمـــایی بـــەكارهێنانی دەنـــگو سەدا دەكات:**

﴿ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ١٩ ﴾ لقمان.

واتـــە: لـــە دەنگـــت بگـــرەوە (زۆر دەنـــگ هەڵمـــەبڕە) چـــونکە ناخۆشـــترین دەنـــگ دەنگـــی کەرانـــە (بـــە هـــۆی زۆر بەهێزییەوە).

هەروەها لە بارەی خۆشیەوە فەرموویەتی:

﴿ نَبِّئْ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ ﴾الحجر.

واتـــە: هـــەواڵ بـــدە بـــە بەنـــدەکانم کـــە: بـــە دڵنیـــایی هـــەر مـــن لێبـــوردەی میهرەبـــانم، هـــەروەها تـــەنیا ســـزای منـــیش سزایەکی بە ئێشە.

## چۆن دەتوانین بانگەوازێکی ڕاست‌و ڕەسەن بۆ ئیسلام بکەین؟

دیارە لە دوای ئەو نۆ (٩) تەوەرەی کە ڕابردن، وەڵامی ئەو پرسیارە ئاسان بووە، بەڵام بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونیی، ئێمە لە دوازدە (١٢) برگەدا، هەندێك تیشك دەخەینە سەر ئەوەی: چۆن دەتوانین بانگەوازێکی ڕاست‌و ڕەسەن بۆ ئیسلام بکەین؟

١)- شارەزاییەکی قووڵ‌و فراوان لە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان‌و، لە ڕێبازی پێغەمبەری کۆتایی (موحەممەد)دا ρ، خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾الأحزاب، واتە: هەر کەسێ فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، سەرکەوتنێکی مەزن، سەرکەوتوە، بە مرادو گەیشتووە، بە ئامانج گەیشتوە.

چـۆن بــه قسـەی خــوا دەکــەین؟ بــه هــۆی پابەنــدی یــه قورئانــەوە، چـۆن بـه قسـەی پێغەمبــەر ρ دەکـەین؟ بـه هـۆی گرتنی ڕێبازو سوننەتەکەیەوە.

٢)- ئاشـــناییەکی بـــاش بـــه واقیعـــی فیکریـــیو سیاســـییو کۆمەڵایــەتیی کۆمــەڵگا، هــەروەها هــەلو مــەرجی سیاســیی ناوچـــەییو جیهـــانیی، پێشـــتریش ئـــەم ئایەتـــەمان چـــەند جارێـــــك هێنـــــا: ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٠٨ ﴾ يوسف.

زۆرجـار تێبینیـی کـراوە، کەسـێ قسـەیەکی هـەقو ڕاسـتی کـردوە، بـەڵام بـه کـەڵکی کـاتو شـوێنەکه نـەهاتوە، قسـەکه هـەق بـووەو، چـاك بـووە، بـەڵام بـه کـەڵکی ئـەوێ نـەهاتوە، جـاری دیکـەش باسـم کـردوە: کـاتی خـۆی (لـه سـاڵی ١٩٨٣ز دا) جارێـك لـه ئۆردووگـای زۆره ملێـی بـه سـێ سـتێن چـوومه

مزگەوتێك، مامۆستایەك وتاری دەدا، ئەو حەدیسەی بۆ خەڵك دەخوێندەوە، کە خولاسەی مانایەکەی ئەوەیە کابرایەك نەوەدو نۆ (٩٩) کەسی کوشتوە، چۆتە لای عابیدێك، گوتویەتی: دەمەوێ تۆبە بکەم، بەڵام نەوەدونۆ قەتڵم کردوە! عابیدەکە گوتوویەتی: بڕۆ خوا لێت خۆش نابێ، ئەویشی کوشتوەو، کردوویەتی بە سەد (١٠٠)، دوایی چووە بۆ لای زانایەك، زانایەکە دڵی خۆشکردوەو ڕێنمایی کردوەو، گوتوویەتی: ڕەحمەتی خوا زۆر لە گوناهی تۆ گەورەترە، بەڵام بچۆ بۆ فلان شوێن، لەوێ خوا پەرستیی بکە، دوایی لە نیوەی ڕێیە فریشتە گیانی دەکێشن، فریشتەی دۆزەخو بەهەشت لێیان دەبێ بە مشتومڕ، سەرەنجام ڕێیەکە دەپێون، دەبینن لەو شوێنە نزیکترە، کە بۆی دەچێو، دەیبەنە بەهەشت[٦٨].

---

٦٨) {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم، قَالَ: كَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ إِنْسَانًا ثُمَّ خَرَجَ يَسْأَلُ فَأَتَى رَاهِبًا، فَسَأَلَهُ فَقَالَ لَهُ: هَلْ مِنْ تَوْبَةٍ قَالَ: لاَ فَقَتَلَهُ فَجَعَلَ يَسْأَلُ

**منیش لە دڵی خۆمدا گوتم: ئێستا چەکداری وای ڕژێم هەیە، هەر پازدە، بیست (١٥- ٢٠) کاروانچیی کوشتوون، دەڵێ: بەخوا جاری زۆری ماوە بۆ نەوەدو نۆ (٩٩)، هەروەها ئەوەی سی چل(٣٠-٤٠) کوشتوون یان ڕووت کردووتەوە، دەڵێ: زۆرم ماوە بۆ سەد(١٠٠) کەس دوایی بە ، دوایی بە مامۆستایەکەم گوت: مامۆستا! کەی ئەو حەدیسە هی ئێرەیە.**

**گوتی: چۆن؟**

**گوتم: ئەو حەدیسەی پێغەمبەر ρ، دەرمانو، چارەسەرە، ئەوە خۆراك (غذاء) نیە، بە کەڵکی هەموو خەڵك بێ، ئەوە دەرمانە، بێگومان ئەوەی پێغەمبەر ρ فەرموویەتی، هەمووی بە کەڵکی هەموو شوێنێکی نایە، هەمووی بۆ**

---

فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: ائْتِ قَرْيَةَ كَذَا وَكَذَا فَأَدْرَكَهُ الْمَوْتُ فَنَاءَ بِصَدْرِهِ نَحْوَهَا فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ وَمَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ فَأَوْحى اللهُ إِلَى هذِهِ: أَنْ تَقَرَّبِي وَأَوْحى اللهُ إِلَى هذِهِ: أَنْ تَبَاعَدِي وَقَالَ: قِيسُوا مَا بَيْنَهُمَا فَوُجِدَ إِلَى هذِهِ أَقْرَبَ بِشِبْرٍ، فَغُفِرَ لَهُ} أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ في: ٦٠ كتاب الأنبياء: ٥٤.

هـــەموو خـــەڵكی نەفـــەرمووە، بـــۆ وێنـــە: یـــەكێ هـــاتوە بـــۆ خزمـــــەتی، گوتوویـــــەتی: (أَوْصِــــنِي) ئامۆژگـــــاریم بكــــە؟ فەرموویـــەتی: (لا تَغْضَــب) [٦٩]، تـــوورە مەبـــە، ســـێ جـــاران، بـــۆی دووبـــارە كردۆتـــەوە، ئنجـــا ئایـــا دەگونجـــێ ، هـــەر كەســـێ بـــێ بـــۆ لات، بڵـــێ: ئامۆژگـــارییم بكـــە! بڵێـــی: تـــوورە مەبـــە؟، هـــی وا هەیـــە لەوانەیـــە، وا پێویســـت بكـــات بڵێـــی: توورەببـــە، چـــونكە لـــەو كەســـانەیە كـــە زوڵمیشـــی لێبكـــەن، مێشـــێ لـــە ئـــاو ناكات.

هــــــەروەها یــــــەكێ هــــــاتوە بــــــۆ خزمــــــەتی گوتوویــــــەتی: (أَوْصِــنِي)، ئـــەویش فەرموویـــەتی: لـــە هـــەر پـــارێز لـــە خـــوا

---

٦٩) {عَنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ، أَنَّ رَجُـلاً قَـالَ: يَـا رَسُـولَ اَللَّهِ! أَوْصِـنِي، فَقَـالَ: لَا تَغْضَـبْ, فَـرَدَّدَ مِـرَارَاً، قَـالَ: لاَ تَغْضَـبْ} أَخْرَجَـهُ اَلْبُخَارِيُّ برقم: ٦١١٦.

بکـــەو لـــە دوای ئەنجامـــدانی هـــەر خراپەیـــەك، چـــاکەیەك بکە، وە بە ڕەوشتی جوان مامەڵە لەگەڵ خەڵك بکە[٧٠].

یـان یـەکێ هـاتوە بـۆ خزمـەتی، گوتوویـەتی: برایەکـەم سـکی دەچـێ، فەرموویـەتی: هـەنگوینی بدەیـە (اسْـقِهِ عَسَـلاً)[٧١]، ئنجـا ئایـا هـەر کـەس، سـك ئێشـەی بـوو، دەڵێـی: هـەنگوینی بـــدەنێ؟! ئەگـــەر ڕیخۆڵـــە کـــوێرەی بـــێ، هەرچـــەندە هەنگوینی بدەیە, پێ خراپتر دەبێو، پێی چاك نابێ.

کەواتـە: گرنگـە کـاتو شـوێنەکە دیـاریی بکـرێ، گرنگـە ئێمـە بـزانین: چ قسـەیەك، لـە چ شـوێنێکدا دەکـەین؟ (لِكُـل مَقـامٍ

---

٧٠) {عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ قَالَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوْصِنِي قَالَ اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ وَأَتْبِعْ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ } أَخْرَجَهُ أحمد برقم: ٢١٤٤١، تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره.

٧١) {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم، فَقَالَ: أَخِي يَشْتَكِي بَطْنَهُ فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلاً، ثُمَّ أَتَى الثَّانِيَةَ، فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلاً ثُمَّ أَتَاهُ الثَّالِثَةَ، فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلاً ثُمَّ أَتَاهُ، فَقَالَ: فَعَلْتُ فَقَالَ: صَدَقَ اللهُ وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ، اسْقِهِ عَسَلاً فَسَقَاهُ، فَبَرَأَ} أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ برقم: ٥٣٨٦.

مَقــال)، ئــەوەش كاتێــك دەبــێ، وێــڕای ئیســلام، شــارەزایی واقیعەکەشمان بین.

٣)- ئیمـــانو تـــەقواو تەزکیـــەی نـــەفسو زیکـــری خـــواو پاڕانەوەی بە کوڵ:

خـــــوا دەفـــــەرموێ: ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ١٥٢ ﴾البقــرة، زۆر تەئکیــد لــەوە دەکەمــەوە، چــونکە پــێم وایــە، ئەگــەر چ بــڕ[٧٢] بــۆ خــوا ســاغ بــین، بــە دڵنیــایی خــوا ڕێنماییمــان دەکــات، چــونکە هــەموو دەمــێ ئــەو ئایــەتو حەدیســانەت هــەموویان لەبــەر چــاو نــین، بــەڵام دڵەکــەت هــەموو دەمــێ لەگــەڵ خۆتــە، پێشــینانمان دەڵــێن: (عــەقڵ لــە دایــكو بــاب چــاکترە)، دایــكو بــاب هــەموو دەم لەگــەڵت نــین، بــەڵام عەقڵەکــەت هــەموو دەم لەگــەڵ خۆتــە، ئنجــا دڵ ئەگــەر ئیمــانی چــاکی تێــدابوو، تــەقوای تێــدابوو، بــۆت دەبێتــە

٧٢) چ بڕ: هەر ئەندازەیەك، کەم یان زۆر.

قیبلەنوماو، ڕێت پێشان دەدا، هەموو دەمێ، ئایەتو حەدیسەکانت لەبەر نین، هەموو دەم کتێبەکانت لەلا نین، تەماشایان بکەی، بەڵام دڵەکەت هەموو دەمێ لەگەڵ خۆتە، بۆیە ئەگەر کاری باش لەسەر بکرێ، ئەو دڵە بۆت دەبێ بە قیبلەنوما، هەقو ناهەق، ڕاستو چەوت، حەڵاڵو حەرامت، زۆرجار بۆ دیاریی دەکات.

٤)- پشت بە خوا بەستنو، ئیرادەو عەزیمەتێکی مەحکەمو نەلەخشاو:

خوا تبارك وتعالى فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ ۝٣﴾الطلاق، واتە: هەر کەس پشت بە خوا ببەستێ، خوا بەسیەتی. بەڵێ بەبێ پشت بە خوا بەستنو، بەبێ ئیرادەو عەزیمەتێکی مەحکەم، لە بەرانبەر ترسو تەماعو هەڕەشەو گوڕەشەو فشاردا، ئینسان ناتوانێ خۆ ڕابگرێ، ئنجا ئەوەی خەڵك لێی

دەترسـێ بـە گشـتی دوو (٢) شـتـە: ١- مـردن، ٢- بـژێو، خـوای تـاكو پـاكیش هـەردووكیانی بـە دەسـت خۆیـەوە گرتـوون: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ كِتَٰبٗا مُّؤَجَّلٗاۗ ﴿١٤٥﴾ ﴾آل عمـران، واتـە: هیچـكەس بـە بـێ مۆڵـەتی خـوا بـۆی نیـە بمـرێ، بـە پێـی نووسـینێكی كـات بـۆ دانـراو. ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا ﴿٦﴾ ﴾هـــود، واتـــە: هـــیچ پێڕۆیەك لەسەر زەوی نیە مەگەر بژێوی لەسەر خوایە.

مـــرۆڤ ئەگـــەر بەڕاســتیی ئیمـــانی هـــەبێ، ڕزق‌و ئەجـــەل، هـــەردووكیان خـــوای پـــەروەردگار بـــۆ هـــیچ كەســـی بـــەجێ نەهێشـتوون، بـــە دەســت خۆیـــەوە گرتـــوون، هـــەر ئـــەو دوو شتەشـن كـە خـەڵك دەترسـێنن، ئنجـا بـە خـوا نـە ترسـنۆكیی تەمـەنی كـەس درێـژ دەكـات، نـە ئازایـەتیی كـورتی دەكاتـەوە، ئـــازاو ترســـنۆك، هـــەموویان وەك یـــەك دەمـــرن، نەفـــەرم بینیـوە لــە شــەڕێدا، لەبــەر ئــەوەی هــەڵاتوە، فیشــەك بــە

پشتی کەوتوە، ئەگەر سەنگەری بە جێ نەهێشتبایە، ڕەنگە سەلامەت بووایە!

٥)- قورئان کردنە پێوەرو تەرازووی گرنگییدان بە مەسەلەکان، بۆ پارێزران لە زێدەڕۆیی و کورتهێنان:

خوا عزوجل دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ وَٱلْمِيزَانَ ﴿١٧﴾ ﴾الشورى، واتە: ئەو خوایەی کە ئەم کتێبەی دابەزاندوە بە هەق، تەرازووشی دابەزاندوە، یاخود بە هەق و بە تەرازووش داییبەزاندوە، (المیزان) دەگونجێ بە ژێر (کسرة) بخوێنرێتەوە، یانی: خوا قورئانی بە هەق و بە تەرازوو دابەزاندوە.

ئەگەر بەسەر (فتحة)یش بێ، یانی: قورئانی دابەزاندوە بە هەق، وە تەرازووشی لەگەڵ دابەزاندوە، کە تەرازووەکەش هەر لە نێو خۆیدایە.

بەڕێزان! ئەم قورئانە گرنگیی بە چ شتێكدات، بە قەدەر ئەوەندەی قورئان گرنگیی پێداوە، ئەوەندە گرنگە، بۆ نمونە: خوای كارزان لە یەك ئایەتدا باسی تەیەمومی كردوە، دەزانم لە دووانـدا باسی كردوە[73]، بەڵام لە یەكێكیاندا، بە شێوەی تایبەت، كە ئایەتی ژمارە شەش (٦)ە لە سووڕەتی (المائدة)، هەروەها لە یەك ئایەتدا خوا باسی غوسڵو دەستنوێژی كردوە، بەڵام ئێمە فیقهی (طهارة)و دەستنوێژو غوسڵو تەیەممومان ئەوەندە قەبەیە! كەچی فیقهی سیاسەتی شەرعییمان ئەو هەموو ئایەتە هەنو، ئەو هەموو فەرمایشتانە هەن، چەند كەمو بچووكە! دەبێ جار جار ڕەخنە لە مێژووی خۆشمان بگرین.

---

٧٣) واتە: لە ئایەتی (٤٣)ی (النساء) و لە ئایەتی (٦) (المائدة)دا.

ئێمـه ئەگـەر بـه ئەنـدازەی ئـەوە کـه کتـێبی خـوا گرنگیـی بـه شــتەکان دەدا، گرنگییــان پێبــدەین، زۆر، زۆرو، کــەم، کــەم[٧٤]، گـیرۆدەی هەنـدێك جـۆرە هەڵـه نــابینو تووشــی زێــدەڕۆییو کـــەم تەرخـــەمیی نـــابین، پێغەمبـــەریش ρ بـــه تەئکیـــد، ڕێبازو سوننەتەکەی هەر به پێی قورئانه.

٦)- خــۆ بــژارکردن لــه ســیفەته نزمــەکانو، خــۆ ڕازاندنــەوە بــه خەســڵەته پەســندەکان، (التخليـة مـن الرذائـل، والتحليـة بالفَضـائل):

خـــوا ســـبحانه وتعـــالی دەفـــەرموێ: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤﴾ الأعلـی، واتــه: بــه دڵنیــایی هــەر کــەس خــۆی پــاكو چـاك بکـات سـەرفرازە. وشـەی (زَکـی)ش سـێ مانـای هـەن: (طَهَـر)، (صَـلَحَ)، (نَمَـا) واتــه: پــاکبۆوە، چـاك بــوو، گەشــەی

---

٧٤) واتـه: ئـەوەی کتـێبی خـوا زۆری گرنگیـی پێـداوە، ئێمـەش زۆر گرنگیـی پێدەدەینو، ئەوەی کەمیشی گرنگیی پێداوە، کەمی گرنگیی پێبدەین.

کـــرد[٧٥]، کەواتـــە: (قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ) یـــانی: ســـەرفراز کەســـێکە کە خۆی: پاك کردوەو، چاك کردوەو، گەشە پێداوە.

٧)- دڵســـۆزیی‌و پـــەرۆش‌و خۆشەویســـتیی‌و بـــە تەنگـــەوەبوون بـــۆ خـــەڵك، بـــە گشـــتی: فەرمایشـــتێکی پێغەمبـــەر ﷺ دێـــنم، بـــۆ ئـــەوەی بـــزانین: پێغەمبـــەر ﷺ چـــەندە بـــە تـــەنگ خەڵکـــەوە بـــووە، خـــەڵك بـــە گشـــتی، بـــە کـــافرو مســـوڵمانەوە، پێغەمبـــەر ﷺ، دەفـــەرموێ: {إِنَّمَـــا مَثَلِـــي وَمَثَـــلُ النَّـــاسِ، كَمَثَـلِ رَجُـلٍ اسْـتَوْقَدَ نَـارًا، فَلَمَّـا أَضَـاءَتْ مَـا حَوْلَـهُ، جَعَـلَ الْفَـرَاشُ وَهـذِهِ الـدَّوَابُّ الَّتِـي تَقَـعُ فِـي النَّـارِ، يَقَعْـنَ فِيهَـا، فَجَعَـــلَ يَنْـــزِعُهُنَّ وَيَغْلِبْنَـــهُ، فَيَقْـــتَحِمْنَ فِيهَـــا فَأَنَـــا آخُـــذُ بِحُجَزِكُمْ عَنِ النَّارِ، وَهُمْ يَقْتَحِمُونَ فِيهَا}[٧٦].

واتــە: وێنــەی مــن و وێنــەی خــەڵك (خــەڵك بــە گشــتی)، وەك پیاوێـــــك وایـــــن، ئـــــاگرێکی کردۆتـــــەوە، کاتێـــــك ئاگرەکـــــە

---

٧٥) بڕوانە: المعجم الوسيط، ص ٣٩٦.

٧٦) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٦٤٨٣، وَمُسْلِمٌ: ٢٢٨٤، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

مەشـــخەڵی داو، دەوروبــەری خــۆی ڕۆشــن کــردەوە، پەپوولــەو مــێش‌و مەگــەز دەکەوتنــە نێــوی، ئــەویش دەری دەکــردن، (بــۆ ئــەوەی بــەو ئــاگرە نــەپڕووکێن‌و نەســووتێن)، ئــەوانیش هــەر خۆیانیــان تــێ دەهاویشــت، ئــەویش دەیویســت دەریــان بکــات، منــیش پشــتێنتان دەگــرم‌و، ڕاتاندەکێشــم، کــە خۆتــان لــە ئــاگر نەهاوێن، کەچی هەر خۆیانی تێدەهاوێن.

کــە بێگومــان مەبەســتی کافرەکــان بــووە، مەبەســتی لــەو خەڵکــە بــووە، کــە بانگیــان دەکــات بــۆ لای خــوا، کەچــی ئــەوان بە دەنگیەوە نایەن‌و، خۆیان بۆ دۆزەخ داوێن.

ئنجــا دەبــێ ئێمــەش ئــاوا بــین، تەماشــا بکــەن پێغەمبــەر ρ چەند نموونەیەکی جوان دێنێتەوە!!

٨)- هـــەبوونی بەرنامـــەو، دامـــەزراوەکان‌و پـــرس‌و، ڕاو، ڕاوێــژ بــە یەکــدی کــردن، بــۆ ڕێــك‌و پێــك کردنــی کــاری بانگـــەواز. پێشـــتریش باسمـــان کـــردو، پێغەمبـــەریش ρ

**دەفەرموێ:** {إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ}[٧٧].

**واتە: خوا چاك ئەنجامدانی لەسەر هەموو شتێك، پێویست كردوە، یانی: دەبێ چاكو ڕێك دەبێ ئەنجام بدرێ.**

**هەروەها فەرموویەتی:** {إِنَّ الله يُحِبُّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ}[٧٨]، **واتە: بە دڵنیایی خوا حەز دەكات، هەركات یەكێك لە ئێوە كارێكی كرد، بە وردەكاریی بیكات.**

**٩)- عەقڵ كراوەیی بە ڕووی شێوازو ئامرازو میكانیزمە تازەو هاوچەرخەكاندا:**

**دەقێك هاتوە زۆربەی زانایان بە شوێنەواریان داناوە:**

{الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ فَحَيْثُ وَجَدَهَا، فَهُوَ أَحَقُّ

---

٧٧) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: ١٧١٥٤، وَمُسْلِم برقم: ١٩٥٥، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: ٢٨١٥، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: ١٤٠٩.
٧٨) أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي فِي "شعب الإيمان" برقم: ٥٣١٢، وَأَبُو يَعْلَى برقم: ٤٣٨٦، وَصَحَّحَهُ الألباني في "الصحيحة" برقم: ١١١٣.

بِهَـا}[٧٩]، واتـه: حيكمـه‌ت، (قسـه‌ى بـاش، زانيـاريى بـاش، شـتى پەسـند) ونبـووى مرۆڤـى بـڕواداره، لـه هـه‌ر شـوێنىَ بيدۆزێته‌وه، له هه‌موو كه‌س پێى شايسته‌تره.

١٠)- خـۆ دوورگـرتن لـه ده‌مـارگيرى‌و خـۆ په‌سـنديى‌و داخراويـى، لـه چوارچـێوه‌ى ڕێكخـراوو گـرووپ‌و مه‌شـڕه‌ب‌و مه‌زهه‌ب‌و ... هتددا.

هه‌يـه خـووى بـه مه‌زهه‌بێكـه‌وه گرتـوه، وا ده‌زانـىَ ديـن بـه‌س لـه ويّدايـه، هه‌يـه بـه مه‌شـڕه‌بێكه‌وه، هه‌يـه بـه شـێخێكه‌وه، هه‌يـه بـه جـۆره كتێبێكـه‌وه، كـاتى خـۆى كـه كتـێبى: (زانايـانى ئيسـلام كـێن‌و چـۆنن؟)م نووسـى، وه‌ك لـه پێشـه‌كييه‌كه‌يدا، ئامـاژه‌م پێكـردوه (لـه چـاپى سـێيه‌ميدا): يـه‌كێك هـات بـۆ لام، گـوتى: مامۆسـتا! هه‌نـدێك كـه‌س ڕه‌خنه‌يان له‌و كتێبه‌ى تۆ گرتوه!

---

٧٩) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: ٢٦٨٧، وَإِبْنُ مَاجَـهْ بـرقم: ٤١٦٩، حَدِيثٌ ضَعِيف، وقال الألباني: ضَعِيفٌ جدًّاً.

گوتم: ئنجا ئاساییە، بەڵام ڕەخنەکە چییە؟

گـوتی: ڕەخنەکـە ئەوەیـە، دەڵـێن: چـۆن پێکـەوە باسـی ئـەبو حەسـەنی ئەشـعەریی‌و، ئـەبوو حامیـدی غـەززالی‌و ئیبنـو تەیمییـەو، ئـەلعیز بنـو عەبـدو سـەلام‌و ئیمـام نـەوەویی‌و ....هتدی کردوە! ئەوانە پێکەوە ناگونجێن؟!

گوتم: کێشەکە چییە؟

گـوتی: کێشـەکە ئەوەیـە دەڵـێن: ئەوانـە هـەر یەکـەی جۆرێکن!

گـوتم: ئـاخر کارەکـە بـەوە چـاك بـووە، کـە هـەر یەکـەی جـۆرێکن، چـونکە پـێم وایـە سـەرجەم زانایـانی ئیسـلام، تـەعبیر لـە ئیسـلام دەکـەن‌و، بـە هـەموویان نوێنەرایـەتیی ئۆممـەتی پێغەمبـەر ﷺ دەکـەن، بـەڵام دیـارە ئـەو کەسـە بـە باریکـە ڕێیـەك دا ڕۆیشـتوەو، وا دەزانـێ: هـەر ئـەو باریکـە ڕێیـە ئیسـلامە! نـا، ئـەوە تـەنیا باریکـە ڕێیەکـەو، دەبـی

بگەڕێیتەوە بۆ شەقامە ڕێیی شەریعەتو دەریای قورئانو سوننەت، بەڵام جۆگەلەکانی: مەزهەبو فەتواو ئیجتیهادو بەرهەمو کتێبی ئەمو ئەو، هیچی بە تەنیا تەعبیر ناکات لە هەموو ئیسلامو، بە هەموویان: تەعبیر دەکەن، لە مسوڵمانەتییو دینداریی، کۆی مسوڵمانانو تێگەیشتنیان بۆ وەحیی.

بە حەقیقەت زۆر گرنگە ئێمە لە بواری بانگ کردنی خەڵکدا بۆ لای خوا، بانگیان بکەین بۆ دەریای فراوانی شەریعەت، بەڕێزان! ڕەجاتان لێدەکەم، بە ناهەق خەڵك لە قوللەی قاف مەکێشنو، مەیانخەنە سەر باریکە ڕێو نێو جۆگەلەی مەزهەبو مەشرەبو بیروڕا جۆراو جۆرەکانەوە، کە سەرەنجام لەوێدا گرفتاریان بکەنو بیانخنکێنن!

بەڕێزان!

دیـــنی خـــوا، خـــەڵك ســـەغڵەت ناكـــات، بۆیـــە هـــەر كـــات سـەغڵەتیی هـەبوو، بزانـە جۆرێـك لـە تێنەگەیشـتن لـە ئـایینی تێـرو تـەواوی خـوای پـەروەردگار هەیـە، هەڵبەتـە سـەغڵەتیی بـەو واتایـە نـا، كـە ئینسـان ئارەقـێ نـەكاو، مانـدوو نـەبێ! بـەڵكو بـەو واتایـە كـە مـرۆڤ عاسـێ بـێو، نـەزانێ چـی بكـات! بـە كـێ بەرنامـەی خـوای كـارزانو میهرەبان هەرگیز خەڵك عاسێ ناكات.

١١)- كـار لەسـەرخۆكردنی جیـددیی لـە هـەموو ڕوویێكـەوە، كـە سـەرەنجام بابـای بانگـەوازكار بـە زمـانی حـاڵو كـردار، هۆكـاری ڕاكێشانی خەڵكو، تێگەیاندنو پێگەیاندنیان بێ، سەر مەشقێكی بـاشو چـاو سـاغێكی دڵسـۆزو ئەمینـداریان بـێ، وەك خـوای بـێ هاوتا لە بارەی پێغەمبەرانی پایە بەرزی خۆیەوە، فەرموویـەتی:

﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَإِقَامَ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءَ الزَّكَاةِ وَكَانُوا لَنَا عَابِدِينَ ﴿٧٣﴾﴾الأنبياء.

واتــە: ئەوانــەمان كــردە پێشــەوايانێك، كــە بــە فــەرمانی ئێمــە ڕێنمایی (خەڵك) بكەن‌و، ئەنجامـدانی كـردەوە چاكەكان‌و بـەرپا كردنی نوێژو زەكاتدانمان بـۆ سـروش كـردن‌و، بـۆ ئێمـە بەنـدەو پەرستەر (ی زۆر چاك) بوون.

هەڵبەتــە كــاتێكیش بانگــەوازكاران كــاری جیــددیی هەمەلایەنــە لەســەر خۆیــان دەكــەن، خۆیــان دەكەنــە خــاوەنی كەســایەتییەكی بەهێزو پێزی وا كە بـە زمـانی كـردارو حـاڵ پـێش قسەو وتـار، خەڵك بەرەو لای خوای بەرزو مەزن‌و ئایین‌و بەرنامەكەی بـانگ بكەن، وەك زۆر جاری دیكـەش گوتوومانــە: زمـانی حـاڵ‌و كـردار زۆر جـــار لـــە زمـــانی قســـەو گوفتـــار كاریگـــەرترە بـــۆ بەرچاوڕوونكردنەوەی خـەڵك‌و ڕێنمـایی كردنیـان، هـەر بۆیـەش گوتراوە: (عَمَل رجُلٍ فِي أَلْفِ رَجُل، أَبْلَغُ مِنْ قَوْلِ أَلْف رَجُل فِـي رجـل) كاریگــەری كــردەوەی پیاوێــك لــە هــەزار پیــاودا، كاریگەرترە لە قسەی هەزار پیاو لە پیاوێكدا.

**١٢)- ڕێــزو تەقــديرو خۆشەويســتيى هــەبوون، بــۆ هــەموو ئەوانــەى لــە بــوارى گەيانــدنى پــەيامى خــواو فێركــردن‌و پــەروەردەكردنى خەڵكــدا، كاردەكــەن‌و، ڕاوێــژو هاوكــاريى كردن لەگەڵياندا.**

**ئــەو قسانەى بۆتــان دەكــەم، بــە جيــددى لــێم وەربگــرن: ئــەوە بــە كــەڵك نايــەت، كۆمــەڵى ئيســلاميى لــەوێ، ئــەوى ديكــە لــەوێ، ئــەوى ديكــە لــەوێ، مــاڵ ماڵۆكێنــە بــە كــەڵك نايــەت، دەبــێ بــير لــەوە بكەينــەوە: ئــەو ماڵانــە هــەموو بكەينــە يــەك مــاڵ، دەبــێ بــير لــەوە بكەينــەوە، بــەلاى كەمــەوە پێكــەوە هاوكــار بــين، ئەگــەر نەشــگونجێ بانگــەوازى ئيســلاميى، بكەينــە يــەك دەنــگ‌و ڕەنــگ‌و ســەنگ، بــا لايــەنى كــەم: لــە يــەك تێگەيشــتن‌و، ئاگــا لــە يەكــدى بــوون‌و، دڵ بــە يەكــدى خۆشبوون‌و، پشتيوانيى يەكدى كردنمان، هەبێ.**

## ناوەرۆك | لا


دەستپێك.................................................. ١

رێ خۆشكردن.............................................. ١٠

تەوەری یەكەم: پێناسەی بانگەواز....................... ١٢

تەوەری دووەم: گرنگیی‌و پێگەو حوكمی بانگەواز..... ٢٦

تەوەری سێیەم: پلەو پایەی بانگەوازكاران............... ٣٣

تەوەرەی چوارەم: ئامانج‌و مەبەستی بانگەواز.......... ٣٩

تەوەری پێنجەم: رێبازی بانگەوازو، شێوازو

ئامرازەكانی.................................................. ٤٩

١)- رێبازی بانگەواز:.......................................... ٥٦

٢- شێوازەكانی بانگەواز:.................................... ٦٣

٣- ئامرازەكانی بانگەواز:................................... ٧٢

تەوەری شەشەم: چەسپاوی رێبازو ئامانجی بانگەوازو،

داهێنان‌و تازەگەری بەردەوام لە شێوازو

ئامرازەكانیدا............................................... ٧٥

تەوەری حەوتەم: بنەما گرنگەكانی بانگەواز............ ٩٢

١- نیازو مەبەستی ساغ (الإخلاص)...................... ٩٣

٢- شارەزایی بە ئایین‌و، ئاشنایی بە ژین ............... ١٠١

٣- هەبوونی نەخشەو بەرنامە + كاری دامەزراوەیی +

راوێژكردن:.................................................. ١٠٦

٤- رەچاو كردنی پلەپلەیی‌و، دیاریی كردنی لە

پێشترەكان:.................................................. ١١٢

٥- دڵخۆشکردن‌و ئاسانکردن (التبشير والتيسير)....... ١٢٠
٦- ئیقناع کردنی عەقڵ‌و جووڵاندنی دڵ................. ١٢٨
٧- بیر خستنەوەی چاکەکانی خوا: (التذكير بنِعَمِ الله). ١٣١
٨- هۆشداریی پێدان‌و ترساندن ............................ ١٣٤
٩- جەخت کردنەوە لەسەر واقیعی ئێستای خەڵك‌و،
پێویستیی خەڵك لە ئێستادا.................................. ١٤١
١٠- جەستاندنی پەیام‌و بەرنامەی خواو، بوونە سەر
مەشق بۆ خەڵك................................................ ١٤٤
تەوەری هەشتەم: ئاکارو ڕەوشتە پەسندە
بنەڕەتیەکانی بانگەوازکاران................................ ١٥٠
١ و ٢ ) ئیمانی مەحکەم‌و دامەزراوو، پارێزکاریی
شایستەو تەواو:........................................ ١٥١
٣ و ٤ )- خوا پەرستیەکی گشتگیرو بەتام، یادی خوا
کردنێکی لە ناخەوەو بەردەوام:........................ ١٥٦
٥ و ٦ )- زانیاریی قووڵ‌و فراوان بە دین‌و، بەرچاو
ڕوونیی‌و شارەزایی دەربارەی ژین:...................... ١٥٩
٧ و ٨ )- دڵسۆزیی‌و بە تەنگەوەبوون بۆ هەمووان‌و،
هێمنیی‌و ئارامیی‌و نەلەخشان:......................... ١٦٠
٩ و ١٠ )- کراوەیی‌و مامەڵەی بەڕێزو سەنگین،
ڕووگەشی‌و قسەو گفت‌و لفتی شیرین:.................. ١٦٦
١١ و ١٢ )- ڕاستیی‌و، دڵ‌و زمان‌و کردەوە یەکبوون‌و،
دادگەریی‌و ئینصاف لەگەڵ دۆست‌و دوژمن:............. ١٧٣

١٣ و ١٤ )- خەڵك بانگكردن تـەنيا بـۆ لاى خـواو، بـە شانازييەوە خۆ ئەژماركردن لە ڕيزى مسوڵمانانـدا :.... ١٧٦

١٥ و ١٦ )- حيكمـەتو دانـايى لــە قسـەو ڕەفتــاردا و، كارليكى ئەرينيى لەگەڵ تێكڕاى تويژەكانى خەڵكدا :.. ١٨١

١٧ و ١٨ )- بــە دڵــى پــڕ بــەزەيىو خۆشەويســتى ئامۆژگاريى كردنو، لە كـاتى ناچـاريیدا : بـەو پـەڕى شێوازى بەرزو پەسند شەڕە قسە ( جدال ) كردن :......... ١٩٠

١٩ و٢٠ )- دووربوون لــە خـۆ بـە گـەورە زانيىو، خـاكى بوونو لێبوردەيىو نەرمو نيانى :...................... ١٩٧

٢٣ و ٢٤ )- بۆ بيروڕاى خۆ دەمارگيرنـەبوونو، بـەردەوام كەم كـوڕيىو گونـاهى خـۆ ديـتنو، بـە كـوڵ لـە خـوا پاڕانەوەو، لە خوتخوتەو دنەدانى شەيتان پەنا بەخوا گرتن :...................................... ٢٠٥

٢٥ ) بە پاڵنــــەرى ڕازيـــــى كردنــــى خـــــواى پەروەردگار، خســتنەڕووى ئيســلام بــە زمــانى حــاڵو كردار:........................................ ٢٠٨

تەوەرى نۆيەم: چەند هەڵەو نەخۆشييەكى بەشێك لە بانگەوازكاران................................................ ٢١٢

١)- بێهێزى لە ڕووى ئيمانو تەقواو تەزكيەو ڕەوشتو ئاكارەوە:........................................ ٢١٣

٢)- بێهێزیی لە ڕووی عیلمیی‌و فیکریی‌و هۆشیاریی سیاسیی‌و کۆمەڵایەتییەوە:................................ ٢١٤
٣)- کەوتنە ژێر کاریگەریی واقیعی لارو ناشەرعیی، چ نەرێتە نەفامییەکانی کۆمەڵگا، چ دەستەڵات‌و ستەم‌و لادان‌و تاوانەکانی:............................................ ٢١٦
٤)- نادیدە گرتنی واقیعی ئێستای کۆمەڵگاو، ژیان لە مێژوودا:.................................................... ٢١٧
٥)- بێهێزیی لە بەرانبەر: ترس‌و تەماع‌و ئارەزووو فێڵ‌و پیلانی ناحەزاندا:..................................... ٢١٩
٦)- دەمارگیریی‌و داخراویی، لە ڕووی فیکرو مەشرەب‌و مەزهەب‌و... هتدەوە:.......................... ٢٢٢
٧)- بەکارهێنانی وشەو تەعبیری بێ نەزاکەت، یان ڕەفتاری نالایق‌و تەشهیر پێکردن:......................... ٢٢٤
٨)- کات بەفیڕۆدان بە قسەو باسی پووچ:................ ٢٢٦
٩)- بەکارنەهێنانی شێوازو ئامرازی نوێ‌و هاوچەرخ:.. ٢٢٦
١٠)- نەشارەزایی لە چاك خوێندنەوەی قوڕئان‌و، کۆلەواریی لە زانستە شەرعییەکاندا:..................... ٢٣٠
١١)- گرنگیی‌و بایەخیی پێویست نەدان بە مزگەوت‌و دەرس‌و دەورو وتارو، قەدر نەزانینی پێشەوایەتیی (إمامة):.................................................... ٢٣١

١٢)- بێ هەڵوێستیی لە بەرانبەر تەوژم و کارو پڕۆژەی ئیسلامییو، پاکسازییو چاکسازیی تێدا کردنی کۆمەڵگادا:........................................... ٢٣٢

١٣)- نەشارەزایی لە زانستەکانی ڕۆژگارو، بێئاگایی لە تەوژمە فیکرییو سیاسییەکان:............................ ٢٣٣

١٤)- بێلایەنیی لە نێوان تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییداو، بگرە (بۆ هەندێکیان) لایەنگریی کردنی تەوژمی عەلمانیی:........................................... ٢٣٤

١٥)- نەبوونی هاوکارییو تەباییو ڕاوێژ بە یەکدی کردن، چ جای یەك بەرنامەییو پێکەوە کارکردنو ... هتد:........................................................ ٢٣٩

١٦)- گیرۆدەبوون بە نەخۆشیی لاسەنگییەوەو، گەورە کردنی شتی بچووكو بچووکردنەوەی شتی گەورە:..... ٢٤١

١٧)- قسەکردنی گشتیی بەبێ دیاریکردنی بە ئامانج گیراوانو، کاتو شوێن، بە جۆرێك کە کەس نەزانێ ڕووی دواندن لە کێیە؟:.................................... ٢٤٤

١٨)- بە پێی میزاجو طەبع خستنە ڕووی ئیسلام، نەك بە گوێرەی تەرازووی شەرعو پێویستیی خەڵكو جەماوەر:.................................................... ٢٤٥

١٩)- دووچاربوونی زێدەڕۆیی (إفراط)و کەم تەرخەمی (تفریط) وەك: زۆر ڕەشبینیی‌و ترساندن‌و نائومێد کردنی خەڵك لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە: زۆر شلکردنەوەی دینداریی‌و دڵنیاکردنەوەی خەڵك‌و، بێ باك کردنیان:................ ٢٤٦

٢٠)- قسەی باش‌و کردەوەی خراپ، یان ڕواڵەت جوانی نێوەڕۆك وێران:................................................ ٢٤٨

٢١)- زۆر دەنگ هەڵێنان‌و هات‌و هاوار کردن‌و، خۆ تووڕەکردن‌و، خۆ ترش‌و تاڵکردن لە کاتی وتاردان‌و قسەکردن دا، بە تایبەت لە وتاری جومعەدا:............ ٢٤٩

تەوەری دەیەم‌و کۆتایی: چۆن دەتوانین بانگەوازێکی ڕاست‌و ڕەسەن بۆ ئیسلام بکەین؟......................... ٢٥١

# ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان

## زنجیرەی ئاگایی

ئەم زنجیرەیە، ناوەندی راهێنان و گەشەپێدان بە شێوەی نامیلکە دەریدەکات، گرنگی بە پێگەیاندنی ئەندامان و کادیرانی کۆمەڵی ئیسلامی دەدات لە بەرفراوانکردنی ئاسۆی رۆشنبیری و برەودان بە بەرزکردنەوەی ئاستی مەعریفی و هۆشیاریان و پێشخستنی چۆنایەتی ئۆرگانەکان لەسەر بنەمای گرنگی و پێویستی قۆناغەکە.

٢٠١٩ز - ١٤٤٠ك